# جگەرە دژی ئازادییە

نووسینی

عبدالقادری توحیدی

چاپی یەکەم

١٤١٧ک

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس و سەنای شایان پێشکەش بە زاتی خوای گەورەو میهرەبان. لێژنە لافاوی ڕەحمەتی خوا برژێ بەسەر گیانی پاکی پێغەمبەری پایە بەرزو یارو هاوەڵە دلسۆزو گیان فیداکانیو پەیڕەوانی هەتا هەتایە.

تا ئێستە دەیان جار سەبارەت بە جگەرە پرسیارم لێ کراوەو بە گوێرەی وەخت کەم و زۆر، باسی ئەو دووکەڵە پیسەم کردووە، وە تا ئەو جێگایەی کە دەستم بەسەریا گەیشتوە خراپیو تاوانی ئەو دووکەڵە زیان هێنەرەم ڕۆشن کردۆتەوەو، ناڕەوابونی کەڵک وەرگرتن لەو گیایەمان لە ڕوانگەی ئایینەوە باس کردووە، بەڵام بەداخەوە تا زەمان درێژتر ئەبێت موسڵمان زیاتر پشت لە ئایین ئەکەن و لەباتی وازهێنان لە تاوانێک خۆیان فڕە ئەدەنە ناو تاوانێکی ترەوە، لە قۆرتێک خۆیان ڕزگار ناکەن لەناو دەیان قۆرتدا سەراسیمە دەخولێنەوە، هەنگاوێک بەرەو خۆشبەختیو سەرکەوتن نانێن دەیان هەنگاو بەرەو ڕۆژ ڕەشیو فەوتاندن ئەنێن!!

بەڕاستی جێگای داخە لەناو موسڵماناندا ئەم هەموو تاوانە

نەکرێن و، داخەکە گرانتر ئەبێت کاتێ کە پاساو ئەدرێن!!

چونکە موسڵمانان هەقیانە واز لەو شتانە بهێنن کە سوودی تیا نی‌یە (من حسن اسلام المرء ترکه ما لا یعنیه).

دیسان موسڵمانان هەقیانە واز لەو شتانە بهێنن کە گومان لە دروست و نادروستیاندا هەیە (دع ما یریبك الی ما لا یریبك).

واتە: واز لەو شتە بهێنە کە گومانی تێدایە بچۆ بۆ شتێک کە گومانی تێدا نی‌یە.

جگەرە تاوانێکە لەو تاوانانە، کە بەشێکی زۆری موسڵمانانی ئەم سەردەمەی لێخن و قێزەون کردووە.

جگەرە دووکەڵێکی تاڵی بەد ئەساڵەو، دڕندەیەکە کە کەڵبەکانی لە جەرگ و دڵی زۆربەی مرۆڤی ئەم سەردەمە گیر کردووەو، دەمی ناوەتە ناو خوێنیان و، خەریکی دەرهێنانی شادەمارەکانیانەو، دەست لە کۆڵیان ناکاتەوە تا دوا دڵۆپەی خوێنیان و، بە ئەفەس لێدانی دوا ئەفەسیان لێ ئەستێنێ.

جگەرەکێشان تاوانە تاوانەکەشی هەموو لایەک ئەگرێتەوە.

جگەرە دژی ئازادی‌یە، لەبەین بەری گیان و ڕوخێنەری پاسای تەندروستی‌یە. جگەرە مرۆڤ بەرەو ستەمکارترین و شیرک ئەبات،

لە ڕیزی تاولنە گەورەکان دا ئاسۆ ئەدات، بە کورتی جگەرە سەرتاپای زیانەو تەنیا بە قەدەغەکردنی مرۆڤ بێ زیانە.

وا ئێمەش لەبەر لابردی ئەو بارە گرانە کە لەسەر شانمانە بەرامبەر بە براو خوشکە موسڵمانەکانمان و، بۆ وەڵام دانەوەی داخوازی چەندین براو خوشکمان دەستمان دایە قەڵەم و کاغەزی سپیو بێ خاڵمان بە بۆنەی نالەباریو نەگریسی جگەرەوە ڕەش کردەوە، بەو هیوایە براو خوشکە موسڵمانە گیرۆدە بووەکانمان لەو پەڵە پەڵە ڕەشانەی تاوان بەخوا ئاسیو دوورکەوتنەوە لە تاوان دڵەکانیان پاک بکەنەوەو، بزانن کە ئایینەکەیان سەرتاپا هەمووی خێرو خۆشبەختی مرۆڤەو، هەرچی لێ قەدەغە کردوون تەنها بۆ سوودی مرۆڤە. جا بۆ ئەوەی چاکتر ئەو دووکەڵە پیسە بناسین وا کەم کەم ئەو خاڵانەی کە لە پێشەوە بە کورتی باسمان کردن بە درێژتر ئەخەینە ڕوو. هیواداریـن سوود بەخش بێت و پاداشتمان هەر لەخوای بێ باک ئەوێت.

پێویستە ئەوەش بڵێین کە ئەوەی باسی دەکەین هەموو زیانەکانی جگەرە نیە چونکە نامانەوێ نامیلکەکە گەورە بێو زەوقی خوێندنەوەی نەکرێت، ئەگینا هەر تەنها سوتانی سامانی

موسلمانان لەبەر چاو بگرین مانگانە دەکاتە سەدان ملیۆن دۆلار!!
ئیتر سوتانی جل و بەرگی جگەرەکێش و... دەیان زیانی تر با
جگەرەکێشان خۆیان بیری لێ بکەنەوە بەتایبەت خوێندەواران و
بپرسن بۆ؟؟

# تاوان نەخۆشیەکی واگیرە

پێش ئەوەی کە بچینە سەر باسەکە پێویستە ئەم چەند وشەیە بخەینە بەرچاو، ئێمە بەندەی خوای خاوەن دەسەڵاتین و زەوی و ئەوەی کە لەناو زەوی دایە هەمووی هی خوایەو ئەو ئامادەیی کردووە بۆمان بە شێوەیەک کە بتوانین سوودی لێ وەرگرین وە بۆ هەموو بەرێکی ژیانی مرۆڤ یاساو بەرنامەی تایبەتی داناوەو پێویستە مرۆڤ لەو بەرنامەیە لانەدات چونکە ئەو دروستی کردووەو دروستکراوی خۆی چاک ئەناسێت و ئەزانێت چە شتێک بۆی چاکەو چە شتێکی بۆ خەراپ. خوای گەورە لەم بارەیەوە ئەفەرموێت: ﴿**وسخر لكم ما في السموات وما في الأرض جميعا منه إنّ في ذلك لآيات لقوم يتفكرون**﴾.

واتە: خوا رام و گەردن کەچی کردووە بۆتان ئەوانەی کە لەناو ئاسمانداییەو ئەوانەی زەویش هەموو هی ئەوەو کەس خاوەنی راستەقینەی هیچ شت نییەو پادشاهی هەر بۆ ئەوەو ئەو پێتان ئەبەخشێت و بۆتان رام ئەکات وە لەم باسەدا چەندین بەڵگە هەیە

لەسەر دەسەلات و هێزی خوا بۆ ئەو گەلەی کە بە باشی بیر بکاتــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــەوە.

لەم ئایەتە پیرۆزەوە بۆمان دەرکەوت کە خاوەنی ڕاستەقینەی زەوی و ئاسمانان و هەموو نیعمەتەکان خوایەو ((جمیعاً منه)) ئێمە وەک خۆمان ئەمانەتین لەسەر ئەم خاکەدا نیعمەتەکانی خوایش ئەمانەتێکی ترەو خوا خستویەتە بەردەستی ئێمەو ڕێگای چۆن پەیدا کردن و چۆن هەڵگرتن و چۆن خەرج کردنیشی بۆ دیاری کردوین و هەموویان بەستراون بە یەکەوە لادان لە لایەکی ئەبێتە هۆی تێکچوونی شیرازەی ژیان، نەک هەر لادەر تووشی ئەبێت، بەڵکو زیانیشی بە خەڵکی تر ئەگات واتە دووچاری تاوان و هەڵە بوون ئەخۆشیەکی واگیرە (ساری)و تەنها بە ئەخۆشەکەوە ناوەستێت، چەندین کەس بەڵکو ئەگەر ڕێگای ئەگیرێت و چارەسەری ئەو تاوان و هەڵەیە ئەکرێت تەواوی کۆمەڵ، دووچاری ئەخۆشی ئەکات.

ئەو دەم هەر کەس بۆ خۆی ئەکەوێت و بە دەردی خۆیەوە ئەناڵێنن کەس ئەسەر کەسی ناپەرژێت کەم کەم وای لێ دێت کە کەس لە ژیانیدا بێجگە لەو ئەخۆشیە شتێکی تر ناناسێت و

نـازانێت و ئـاوی شـیرینی بـەدەم تاڵــە وەكۆ ئــەمڕۆی ئێمــە كـە هەموومان لە یاسا بەرزو بەقیمەتەكی خـوا لامـان داوەو دووچاری ژیانێكی تاڵی وا بووین كە كەس ئەسەر كـەس، نایپـەرژێت و هـەر كەس لەبیری خۆیدایەو بەخۆشیا ناگات ﴿ومن أعرض عن ذكـري فانّ له معيشة ضنكاً﴾[1] لە هەموو شتێ سەیر تـر ئەوەیـە كـە ئـەم سەرگەردانیو بەرەڵاییو نەخۆشییە گرانانــە بـە پێشـكەوتنی!! یـان شارستانیەتی!! ناو ئەبەن.

ئایین پیرۆزی ئیسلام بەهەمووی ئەوترێت ئایین و بەش بـەش و جیا جیـا نـابێت و لادان لەهـەر لایـەكی ئەبێتـە هـۆی تێـكۆ دانـی چەندین لای تر، ئەگەر بەرەنگاری ئـەوەڵ تـاوان نـەكرێت كـەم كـەم تەشەنە ئەكات و ئەداتە بەرچون خوای گەورە ئەفـەرموێت: ﴿وكـل شيء عنده بمقدار﴾[2] واتە: هەموو شتێكۆ لای خوا بـە شـێوەیەكی ئەندازە گیراوەو تێهەڵكێشی یەكترن و یـەكێكیان لـە خشـتە تـرازا هەموو لاكانی تر خوارو لار ئەكات وە ئەفەرموێت: ﴿انّا كلّ شـيء

---

[1] واتە: هەر كەسێ پشت كاتە قورئان كە یاساو بەرنامــەی خوایـە ژیـانی زۆر تـەنگۆ ئـەبێت. سورەتی -طه- ١٢٤.

[2] سورەتی -الرعد-٨.

خلقناه بقدر﴾ واتـه: بەڕاستی ئێمە هـەموو شـتمان لـە ڕووی ئەندازەو بە گوێـرەی پێویسـت دروست کـردووە بونـەوەر هـەمووی دروست کراوی خوای خاوەن دەسەلاتەو بە شێوەیەکی ڕێکـ و پێـکـ و تێهەڵکێش بەسـراون بەیەکـەوەو مـرۆڤ نـەیتوانیوەو ناشـتوانێت تەواوی ئەم پەیوەندییانە بناسێت خـۆ بـەخۆ بەڵکـە ئـەبێ لەبـەدی هێنەری ئەم بوونەوەرە یاسا وەرگرێت و پەیڕەوی لێ بکـات تـا لـەم بوونەوەرەدا بەدەست خۆیەوە دووچاری سەر لێشـێواوی و ڕۆژ ڕەشی نەبێت واتە: بۆ ئەوەی کە لەم ژیانەدا بە کامەرانی و ئاسـایش بژیـن پێویستە لە خوای گەورەو زانا یاسا وەرگرین چۆن تەنها ئەو زاتەیـە کە ئێمەو باقی بونەوەرو پەیوەندیەکانی نێوانمان بە باشی ئـەزانێت و ئەتوانێ یاسای ڕێـکـ و پێکی بـۆ دابنێت وە بونـەوەر هـەمووی بەندەی ئەون و بەبێ جیاوازی، ئەو ئاگای لە تەواوی چەرخ و زەمـان هەیەو دروستکەری خواست ئارەزۆ ئاشکراو پەنامەکیەکانی مرۆڤەو دابین کەری بەرژەوەندی تاکـ و کۆمەڵەو بەخشـندەی هـێزو پـێزە، کەواتە ئەبێ هەر لەو یاسا وەرگیرێت، پەیڕەوی تەنیا لە یاسای ئـەو بکرێت کە قورئانی پیرۆزەو مایەی خۆشبەختی دوو جیهانەو هەر بە دواکەوتنی و پەیڕەوی کردنی ئەو مرۆڤ بەرێزە (فیه ذکرکـم) لادان

لەو ڕێبازەو گوێ نەدان بەو بەرنامەیە ئەبێتە هۆی پچڕانی مرۆڤ لەم بوونەوەرەو نامۆ بوونی مروڤ لەگەڵ تەواوی دروستکراوەکانی خوادا تەنانەت نامۆ بوونی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا ووتراوە (**من عرف نفسه فقد عرف ربّه**).

واتە: ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی بناسێت خوایش ئەناسێت. وە ئەکەوێتە ناو داوی نەفس و شەیتانەوە تا دەست لە لایەک بدات دەیان و سەدان لای تری بەسەردا ئەڕوخێت چونکە نیشەکانی بە پێچەوانەی یاسای بوونەوەرە تاجە ڕێک توند کاتەوە سەدان جەڕی تری شل ئەبێت ﴿**إنّا كلّ شيء خلقناه بقدرٍ**﴾**القمر: ٥٩**.

کەوابوو تاوان و هەڵە هۆی تێک چوونی ژیانەو پێویستە بەرەنگاری بکرێت ئەگینا زیان گەیەنەرە بە هەموان وەک ئەو کەسەی کە سایقی نەزانێت و بە کەیفی خۆی بچێتە سەر سەیارەو بە کەیفی خۆی لێ خوڕێت ئەمە ئەگەر بەرگری نەکرێت دەیان زیان تووشی خۆیو خەڵک ئەکات لە ڕاستیدا لادان لە یاسای خوا نیشانەی نەزانین و دوا کەوتن و گەڕانەوەیە بۆ سەردەمی نەفامی نەشارستانیەتیو پێشکەوتن، خوای گەورە ئەم ڕاستیە ڕۆشن ئەکاتەوەو ئەفەرموێت: ﴿**ثم جعلناك على شريعة من الأمر فاتبعها**

﴿ولا تتبع أهواء الذين لا يعلمون إنهم لن يغنوا عنك من الله شيئ وانّ الظالمين بعضهم أولياء بعض والله ولي المتقين﴾الجاثية: ١٩-١٨

واته: ئه پاش ئايين و پيغه‌مبه‌ره‌كاني تر (درودي خوايان لي بي) ئه‌ي محمد ﷺ ئيمه تۆمان دانا له‌سه‌ر ريبازيك كه فرماني ئيمه‌يه ده تۆش په‌يره‌وي له‌و به‌رنامه‌يه بكه‌و دواي ئه‌وات و ئاره‌زۆي نه‌زانه‌كان نه‌كه‌ويت به‌راستي ئه‌وان ناتوانن بتپاريزن له هيچ تۆلـه‌و سزايه‌كي خوا وه به‌راستي سته‌مكاران هه‌نديكيان دۆست و لايه‌نگري هه‌دديكيانن وه خوا دۆست و لايه‌نگري په‌رهيزكارانه

خوێنه‌ري به‌ريز ئه‌گه‌ر به چاكي له‌و چه‌ند ئايه‌ته فه‌رمووداسه‌ي پيشه‌وه سه‌رنج بده‌يت بۆت ده‌رئه‌كه‌ويت كه ته‌نيا خوايه مافي ياسا داناني هه‌يه وه ته‌نيا ياساكه‌ي ئه‌وه دابين كه‌ري به‌رژه‌وه‌ندي تاك و گشتي كۆمه‌ڵ وه هه‌روه‌ها بۆت ده‌ركه‌وت كه لادان له‌و ياساو ريبازه به ماناي خۆكوشتني راسته‌قينه‌يه چونكه لادان له‌و ياسايه دژايه‌تي هه‌موو بوونه‌وه‌ره به گشتي‌و دژايه‌تي نه‌فسي خۆته به تايبه‌ت.

دیاره لـه دژایەتی وادا بەزین و ژێرکەوتن مسۆگەره بــەڵێ

ڕێبازی ئیسلام ڕێبازی خوای توانــاو زانــاو کـار بەجێیەو هەروەک

لەگەڵ تەواوی بوونەوەردا بە شێوەی تێهەڵکێش بەسراوه بە یەکەوە

ئاشکراو ڕونتره کە هەموو پارچەو لق و بەشەکانی ئەو یاسایە گــرێ

دراون بـە یەکەوەو لادان لـە بەشێکی ئەبێتـە هـۆی ئەخۆشــیەکی

واگیرو لـق و پارچەکانی تـری ئەگرێتـە بــەر. کــەوابوو پێویســتە

موسڵمانان ئایینەکەیان بەوردو درشتیەوە بناسـن و، لـە هـەموو

هەڵەیەک خۆیان بپارێزن و ئاگاداری بێجگە لە خۆشیان بـن کـە بـە

هەڵە دانەچن و، دژایەتی ئەو یاسا بەرزه نەکەن، چـۆن لـە ئـایندەی

نزیکدا خراپی ئەو هەڵەیـە هـەردوولا ئەگرێتـەوە وەک لـە پێشـەوە

بۆت دەرکەوت هەروەها بەو شـی کردنـەوە کورتـە، پوچەڵیو بـێ

ناوەڕۆکی ئەو قسانەتان بۆ دەردەکەوت کـە ئـەڵێن (کـەس ناخەنـە

قەبری کەس)و (بزن بە قاچی خۆیو مەڕ -مێ- بەقاچی خۆی)!!

(هەر کەس بە لاقی خۆی هەڵ دەبەسترێت)!! جوانـترین بەڵگـە

لەسەر ئەم وتەیە فەرموودە بەنرخەکەی پێغەمبەری مەزنـە (درودی

خوای لـێ بێـت) کـە ئەفـەرموێت: (کـلاّ وا لله لتـأمرنّ بـالمعروف

ولتنهُنّ عن المنکر ولتأخذنّ علی یـد الظـالم ولتأطرنّـه علـی الحـق

أطراً ولتقصرنّه على الحق قصراً أو ليضربن الله بقلوب بعضكم على بعض ثم ليلعنكم كما لعنهم).

واته: نابێ بێ دەنگ بن یان ماندوو ببن لە فرمان بە چاکە کردن و بەرگری بکەن لە خراپەو دەستی ستەمکار بگرن و حەقتان خۆش بوێت و، لەسەر حەق و ڕاستی پێ بەگەز بدەن وە یان خوا بتانکات بە دوژمنی یەکتر لە پاشا نەفرینتان لێ بکات وەکو چۆن نەفرینی کرد لە خراپکارانی بەنی ئیسرائیلی. -

خوێنەری بەڕێز، لەم بارەوە سەدان ئایەت و فەرموودەی تر هەیەو لێرەدا لەوە زیاتر نانووسین، خۆت پەڕاوە پیرۆزەکەی خوا بخوێنەوەو سوودی لێ وەرگرەو سەرنجێک لە فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەری پایە بەرزﷺ بدەو جوانتر ئایینەکەت بناسەو قۆڵی مەردانەی لێ هەڵکەو پەردەی تاریک و ڕەشی شەوەزەنگی نەفامی لەسەر چاوان لادەو ببە بە بانگ کەری ڕێگای خوا (جل جلالە): ﴿ومن أحسن قولاً ممن دعا الى الله وعمل صالحاً وقال إنني من المسلمين﴾[٣].

---

[٣] کێ هەیە قسەی چاکتر بکات لەو کەسەی کە خەڵک بەرەو ئایینی خوا بانگ کات و ئیشی چاک بکات و بڵێ من لە موسڵمانم -حم- السجدة-٣٣.

خوێنەری بەڕێز وا بزانم ئیتر ئەوەت بۆ ئاشکرا بوو کە تاوان ئەنیا بۆ تاوانبار زیانی نییە بەڵکو ئەخۆشیەکی واگیرەو کەم کەم تەشەنە ئەکات و کۆمەڵ دووچاری زۆر ڕەشیو لێکدان و تێکدان و لێکدوان و چەرمەسەری ئەکات. جا زۆر پێویستە بەرگری بکرێت. ئەوە چۆنە لەکاتی پەیدا بوونی ئەخۆشیەکی واگیردا پزیشکەکان دەست ئە کوتانی خەڵک ئەکەن و هەندێ کات ڕێگای هاتووچۆو ئەم لاو لای لێ قەدەغە ئەکرێت تا ئەو ئەخۆشیە بڵاو ئەبێتەوەو زیان بە تەندروستی خەڵک ئەگەیەنێت[٤] بەڵام ئەوە بۆ تاوان کردنەکە کە ئەخۆشیەکە لە هەموو ئەخۆشیەکانی تر خەتەرناک ترو واگیر ترە (ساري) پزیشک و بەناو پێشکەوتوەکانمان ڕێگای ناگرن؟!! بانێکەو دوو هەوا!!

خۆزگە هەر بەبێ دەنگیو لالانە بوەستانایە؟!! چونکە زۆربەیان خەڵکی بەرەو تاوانکردن هەڵ ئەنێن و تاوان کردن و سەرپێچی فرمانی خوا بە پێشکەوتن دائەنێن!!!

---

[٤] مەبەست ئەوە نییە کە ئەو سەرگرییە بە شتێکی بێ کەڵک ڕابێین بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەگەر ناسوودمەندو خۆشبەختی مرۆڤ مەبەستە ئەی بۆچی ڕێگای تاوان ناگرن خۆ تاوانکردنیش نەبێتە هۆی دەمان ئەخۆشی ناو کۆمەڵ ئەگەر ژیرەو بیر هەست.

﴿أفحكم الجاهلية يبغون؟! ومن أحسن من الله حكماً لقوم يوقنون؟﴾(المائدة: ٥٠) هیوادارم هەمو خوێنەرەواران و ڕۆشنبیران خۆیان گێل نەکەن و بیریان لێڵ نەکەن، ناحەزان لە ئاوی لێڵ دا ماسی نەگرن قسەی زرق و برقی بێ کاکڵە نەیانخاتە ناو داو!! باڵداری وەک کەو بە دێوجامە نەگیرێ!!

تەنها دروست کەر ئەتوانێت یاسا دانێت دروستکراو خۆیشی ناناسێت؟! تەنها قورئانە یاسای مرۆڤ، مرۆڤ نەکەیت بە بەندەی مرۆڤ!!

# ئازادی کامەیە؟

ئەی ئازادی بەناوتەوە چەند تاوان ئەکرێت. خوێنەری بەڕێز هیچ شتێک بێ سنور نییە ئازادیش ئەگەر ببێت هەر شتەو لەو یاسایە دەرناچێت ئایینی پیرۆزی ئیسلام بە وشەیەکی بچوک و بێ دەردەسەری سنوری ئازادی بێ دەردی سەری دیاری کردووەو ئەفەرموێت (لا ضرر ولا ضرار) هەرچەند ئەم فەرموودە بەنرخەی پێغەمبەری مەزنﷺ لەبەر کورتیو پڕ مانای خۆی قسەو باسی زۆری لەسەر کراوە بەلام پوختەکەی واتە: زیان نییە نە لە خۆت نە لە خەلک جا چاک لەم مانایە ورد بەرەوە.

بەلێ، تۆ ئازادیت هەر شتێک بە سوودو قازانجی خۆت بێت ئەنجامی دەیت و هەر شتێک بەزیانت بێت لێی دوور کەویتەوە بە مەرجێک زیان بە خەلک نەگەیەنیت ئەم یاسایە بۆ هەموو مرۆڤێکە.

واتە ئازادی یەک لایەنە نییە داوا لە هەندێک بکات کە زیان بە خەلک نەگەیەنن و واز لە هەندێکی تر بهێنێت. بۆ جوانتر ڕوون کردنەوە، ئەم چەند نمونەی خوارەوە ئەخەینە ڕوو:

یەکەم:

تۆ ئەتوانیت ڕادیۆت هەبێت و گوێ لە رادیۆ بگریت بەڵام بۆت نیە ئەوەندە دەنگی بەرز کەیتەوە کە دەراوسێکانت بیبیستن و ئازاریان پێ بگات یان منالەکانیان لە خەو خەبەر کاتەوە. ئەگەر ئەڵێی من ئازادم لە دەنگی رادیۆی خۆمدا! ئەویش هەر ئازادە پارێزاگاری لە مافی خۆی لە چوار دیواری خۆیدا بکات.

دووهەم:

تۆ ئازادی قورئان لەهەر جێگاو شوێنێکی پاکدا بخوێنیت بە مەرجێک ئەوەندە دەنگ بەرز نەکەیتەوە کە نوێژکەرێک نوێژەکەی لێ تێک بچێت یا منالی دراوسێکانت لە خەو خەبەر کەیتەوە جا ئەگەر ئەڵێیت من ئازادم ئەویش هەر وەکو تۆ ئازادە مافی هەیە پارێزگاری لە ئازادی خۆی بکات.

تۆ ئەگەر گوێ بە یاسای حەڵاڵ و حەرام نەدەیت و شەرم لە خواو خەڵک نەکەیت و موسڵمانیش نەبیت بۆت نیە لە سەیارەیەکدا کە کەسێکی جگەرەنەکێش و بێزار لەو دووکەڵەی تیابێت تۆ دەست کەیت بە جگەرەکێشان چونکە ئەگەر ئەڵێیت کاکە من ئازادم! ئەویش ئەڵێ: کاکی ئازادی خواز ئازادی یەک لایەنە نیە منیش هەر ئازادم وەک تۆو ڕەوایە بۆم کە نەیەڵم ئەم

زیانەم لێ بدەیت چۆن تۆ لەبەر ئەوەی کـە بـێ تاقـەت نـەبیت لـەم ماوە کەمەدا ئەتەوێ زیان بەمن بگەیەنیت؟!!

برام وا دیارە تۆ لـە ئـازادی دژەکـەیت وەرگرتـووە. واتـە سـتەم کاریو ملهوڕی؟!

چۆن تۆ ئەتەوێت هەرچی بکەیت کەس نەڵێ کەرت بە چەند؟!!!

کاکی ئازادی خواز بە ڕاستی یان نەخوێندەواریت یان لـە کـاتی خوێندنەوەی مانای ئازادیدا چاوت بە هەڵە کەوتوەتـە سـەر مانـای دیکتاتۆری چونکە بەڕاستی ئەو مانایـە کـە تـۆ لـە وشـەی ئـازادی وەری ئەگریت بێ کەم و زیاد مانای دیکتاتۆرییە!!

چوارەم:

کابراکە دووچاری نەخۆشی واگیر بوو ئازادە لـە چارەسـەرکردنی خۆیدا بەڵام نابێ بە شێوەیەک بجوڵێتەوە کە خەڵک تووش کات!!

ئـازادی قسـە بکـەیت بـەڵام بـۆت نیـیە ئـەوەندە دەنـگ بـەرز کەیتەوە کە مێشکی خەڵک ماندوو کەیت!!.

ئـازادی هـەر بـیرو بـاوەڕێک قبـوڵ کـەیت بـە مـەرجێک زیـان نەگەیەنیت بە بـیرو بـاوەڕی خـەڵک ئـازادی لـە هـەڵبژاردنی هـەر شتێک بەڵام نابێ لـەو ئیشـەدا فێـڵ و فـڕ لـە خـەڵک بکـەیت بـە کورتی لە یاسای ئازادیدا هیچ شتێکی مرۆڤ بێ سـنور نیـیە هـەر

جموجولێـكێ لـەو سـنورە دەرچێـت بـەرەلایی‌و سـەرەڕۆیی‌یـە هــەر کەسێکێ لە سنوری ئازادی دەرچێت و تەنها لـە بـیری خۆیـدا بێـت ئەوە ئەو کەسە ستەمکارو داگیرکەرو ملهوڕو دیکتاتۆرە لایەنەکەی تر ستەم لێکراوو ماف پێشـێل کـراوو هەلخەلـەتێنراوو سـوود لـێ وەرگیراوە کە ئەمانە هەموویان ناڕەواو ناپەسندو حەرامن و مرۆڤی عاقڵ و رۆشنبیر توخنیان ناکەوێت وە لەو کەسەش حاشا نەکات؟!!

جا بە ورد بوونەوە لەم چەند کەلیمەیـە لات ڕوونـە کـە جگـەرە چەند دژی ئازادی‌یە چونکە جگەرە زیانێکی ئاشکراو ڕوونی هەیــەو کەس لەدەست زیانی ڕزگـاری نـابێت تەنانـەت ئـەو کەسـانەش کـە جگەرە کێش نین، بۆ نموونە ڕۆژنامەیـەکی ئـەمریکایی لـە سـالی (١٩٧٩)دا ڕایگـەیاند کـە لــە ٧٥٪ ژنـانی ئـەو پیاوانــەی کــە جگەرەکێشن لە ئەمریکا دووچاری نەخۆشی شێرپەنجە (سرطان)ی لێوو زمـان بـوون هـەروەها زۆربـەی ئـەو پزیشـکانەی کـە لـەبارەی جگـەرەوە لێکۆڵـنەوەیان هەیـە ئـەلێن: جگـەرە ئەگـەر زیانەکـەی بکرێت بە سەد بەشەوە سی (٣٠) بەشی بۆ ئـەو کەسـانەیە کـە لـە نزیکی جگەرەکێش دان.

جا ئەو کەسـانەی کـە لـەناو کـۆڕو کۆمـەڵ و نزیکـی خەڵکـەوە جگەرە نەکێشن نەکێ تـەنها زیـانی تەندروسـتی‌و مـالی لـە خۆیـان

ئەدەن بەڵکو زیانی تەندروستی دەست بەجێو ماڵی ئـایندەش لـەو خەڵکە ئەدەن و بەو ئیشەیان هەم زیانیان لە خۆیـان داوەو هـەم لـە خەڵکیش جا ئەگەر بڵێین زیانی خۆیان کەیفی خۆیانە!!

کە ئەویش هەر ڕەوا نىیەو بە یارمەتی خوا لـە جێگـەی خۆیـدا باسی ئەکەین -ئەی زیانی خەڵکی چی؟!

ئەگەر جگەرکێش دەڵێ ئازادم خۆ ئەو خەڵکە بەندەی ئەو نـین کـەوا بـوو جگەرەکێشـان دوژمنێکـی ڕاسـتەقینەی ئازادیـیـەو جگەرەکێش پێشێل کـەری مـافی ڕەوای خەڵکـەو گاڵتەچیـیـە بـە ژیری و عەقڵی ئـەو خەڵکـەو پیـس کـەری هەوایـەو بـڵاو کـەرەوەی چەندین جۆر میکرۆبی نەخۆشی!! بە کورتی جگەرەکێشان ئیشێکی سـەدا سـەد دژی ئازادیـیـەو لابردنـی ئـازادیش پێچەوانـەی بڕیـارو یاسـای ئیسـلامە ﴿فمـن اعتـدى عليكـم فـاعتدوا عليـه﴾ بـراو خوشکە موسڵمانەکان چاک لەو زیانانەی ورد ببنـەوەو بـە خـەڵکی ڕاگەیـەنن تـا بـەڵکو ئـەو خەڵکـەش لـەو بـەڵا خەتـەرناک و پـڕ مەترسىیە ڕزگاریان بێت و ژیانی هەمووەمان ژیانێکی بـێ دووکـەڵ بێت.

# ماڵ فەوتاندن نارەوایە

لە ڕوانگەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە سەروەت و سامان هی خوایەو مرۆڤ جێنشین و نمایندەی خوایە لەم سەر زەویەدا، پێویستە بە گوێرەی یاسای خوا بجولێتەوە، هەر بەلاو سەختی‌یەک کە بەهۆی لادان لەو یاسایەوە دووچاری مرۆڤ ببێت ڕاستەوخۆ خۆی لێ‌پرسراوە.

یاسای ئیسلام یاسایەکی گشتی‌و بۆ هەموو شت و کاتە، وە هیچ شتێک نی‌یە کە لەو یاسایەدا بڕیاری لەسەر نەبێ‌و، ئەوەی کە مرۆڤ پێویستی پێی ببێ بەلگەیەک یا زیاتری لەسەرە. بە کورتی یاسای ئیسلام تاقانە ڕێبازی بەختەوەری‌و سەرفرازی مرۆڤە لە هەردوو جیهانداو، هەر شتێک کە قازانج و سوودی خەلکی تیا بێت بە ڕەوای دائەنێت وە هەر شتێک کە زیانی خەلکی تیا بێت بە نارەواو پیسی دائەنێت، سەروەت و سامان یەکێکە لەو نیعمەتە لە ژمارە نەهاتوانەی خواو پێویستە بە گوێرەی یاسای ئەو پەیدای بکەین و، بە پێی ئەو یاسایەش خەرجی بکەین، ئەگینا دووچاری سەر لێشێواوی‌و ڕۆژە ڕەشی دنیا ئەبین و، لە ڕۆژی دواییشدا لە

تۆڵەی ئەو لاساری و سەرپێچیەدا سزا ئەدرێین. کەوابوو پێویستە لە خەرج کردندا ئاگامان لە خۆمان بێت و ماڵەکەمان بەبێ کەڵک لەبەین نەبەین. لەبەین بردنی ماڵ ئەبێ بەهۆی ڕق و قینی خوای خاوەن نیعمەت و کەرەم و، ئەبێتە هۆی نەمانی بەرەکەت و فەڕ لەو ماڵەدا، بۆیە پێغەمبەری مەزنﷺ ئەفەرموێت: (خوا سێ شتی ئێوەی پێ ناخۆشە، یەکێک لەو سیانە زایەکردنی ماڵە).

دەی ئایا جگەرە کێشان ماڵ زایەکردن نیە؟ خۆ ئەگەر نەڵێین حەرامەو، تەنها تەماشای ماڵ خەرج کردن و لەبەین بردنی ماڵ بکەین ئەبینین لەم فەرموودە بەرزەی خوای زاناو کاربەجێ دەرنەچووە کە ئەفەرموێت: ﴿ولا تسرفوا انه لا يحب المسرفين﴾(الأنعام: ١٤١).

واتە: زیادە خەرجی نەکەن بەڕاستی خوا زیادە خەرجکەرانی خۆش ناوێت. جگەرە نەک تەنها ماڵ بە زیادە خەرجکردن نیە، بەڵکو ماڵ لەبەین بردن و ماڵ زایەکردنە، کە خوای گەورە زۆر بە تێندی سەرکوتی ئەو کەسانە ئەکات و ئەیانکات بە برای شەیتان و ئەفەرموێت ﴿ولا تبذر تبذيرا ان المبذرين كانوا إخوان الشياطين وكان الشيطان لربه كفورا﴾.

واتە: ماڵ زایە نەکەن. بەڕاستی ئەوانەی کە ماڵ زایە ئەکەن براکانی شەیتانەکانن و، شەیتانی بێ باوەڕ بوو بە نیعمەتەکانی خوای خۆی بۆیە نەفرینی لێ کرا.

ئەو کەسەی کە ڕێزی نیعمەتەکانی خوا نەگرێت و لە جێگای خۆیدا خەرجی نەکات ئەبێتە هاوتاو هاوڕێنەی شەیتان.

خوێنەری بەڕێز! زیادەڕەوی لە نان و ئاودا ئەبێتە هۆی زیان بۆ خەڵک و لادان لە یاسای خواو عاجز بوون، عاجز بوونی خوایش شتێکی ئاسان نییە، جا نان و ئاو لە کوێو جگەرە لە کوێ؟ جگەرە ماڵ زایە کردنە، جگەرە بێجەگە لەوەی کە سوودی نییە بۆ هیچ کەس زیانی هەیە بۆ هەموو کەس. کەوابوو جگەرەکێشان تاوانێکە ئەکەوێتە ژێر ماڵ زایە کردنەوە (تبذیر) چۆن تەبزیر ماڵ زایە کردنە جگەرە ماڵ زایە کردنە لە شتێکا کە ئەو شتەش (جگەرە) زیانی هەیە بۆ هەموو کەس، کاکی موسڵمان! خۆت بە وردی لەو ئایەتانەی سەرەوە کە باسمان کردن سەرنج بدەو تەماشاکە بزانە جگەرە چەند پیسەو چەند ماڵ فەوتێنەرە!! وە ماڵ فەوتاندنیش وەک لەو چەند ئایەتو فەرموودانەی پێغەمبەرەوە ﷺ دەرکەوت حەرامە. کەوابوو جگەرە حەرامە؟؟!!

# کێ ستەمکارترە؟؟

ستەم، کردن یانی کردنی هەر شتێک کە جێگای خۆی نەبێت، (الظلم وضع الأمور في غير موضعها).

سێ بەشە، هەر چەند ئەگەر بە وردی تەماشای هەر کامیان بکەین ئەوانی تریش ئەگرێتەوە، بەلام بۆ ئەوەی کە چاکتر لە مەبەستەکە حالی ببیت ئەم دابەشەی ئەکەین و، لە پاشا بزانە جگەرە لە کام بەشیاندا بە زەقی خۆی پیشان ئەدات:

١- ستەم کردنی مرۆڤ لە خۆی وەکو خۆکوشتن.

٢- ستەم کردنی مرۆڤ لە خەڵک وەکو ئەشکەنجەو ئازاری خەڵک.

٣- ستەم کردنی مرۆڤ لە خۆیو لە خەڵکیش.

ئاشکرایە هەر ناوی ستەمت برد بەشی دووهەم و سێهەم لە خەیاڵی مرۆڤدا ئامادە ئەبێت. ئەوەندە تاوانێکی ناڕەواو ناپەسەندە، بەلام باش بزانن کە بەشی یەکەم لەوان تاوان ترە چونکە کەسێ بۆ خۆی بەزەییو سۆزی نەبێت بۆ خەڵک چۆنە؟! پێغەمبەری مەزنﷺ ئەفەرموێت: (أظلم الناس من ظلم نفسه)

واتە ستەمکارترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە ستەم لەخۆی ئەکات.

جا کاکی دووکەڵیی! تۆ بەر کامیان ئاکەویت؟؟!! ئایا دووکەڵەکەی تۆ پێش هەموو کەس زیانی بۆ خۆت نی‌یە؟؟!! وە ئایا زیانی بۆخەڵکیش نی‌یە؟؟! دەی نازانی بەم زیانانە ئەچیتە ریزی ستەمکارانەوە؟؟!! وە ئایا ئیشەکەت ڕەواو لە جێگای خۆیدایە؟؟ وە ئایا نازانیت خوای گەورە هەرەشە لە ستەمکاران ئەکات و ئەفەرموێت ﴿ألا لعنة الله على الظالمين﴾ واتە، ها، بزانن کە نەفرینی خوا لە ستەمکارانە. کاکی دووکەڵیی! تۆ لە ستەمکاریدا پلەت زۆر بەرزە، چونکە دووکەڵەکەی تۆ زیانی گیانی‌و ماڵی سەدا سەدی هەیە بۆ خۆت لە پاشا لە سەدا سی ٣٠٪ زیانیشی هەیە بۆ خەڵک، زیانی گیانی‌و تەندروستی دەست بەجێ، وە زیانی ماڵیی ئاییندە بەهۆی نەخۆشی‌و داوو دەرمان، کە دووکەڵەکەی تۆ بووەتە هۆی ئەو نەخۆشیانە، دەی ئایا تۆ یەکێک لە ستەمکارترین مرۆڤان نیت؟؟!!

جا ویژدانی خۆت بکە بە قازی‌و داوای بڕیاری لێ بکەو بزانە چ بڕیارێکت لەسەر ئەدات؟! جا بەر لەوەی بکەویتە پێش دەم قازی‌و بڕیارت لەسەر دەرکات، واز لەو هەموو تاوانە -کە بەهۆی ئەو

دووکەڵەوە تووش بویت- بێنەو دان بە هەڵەکانی پێشوتا بنێو (من اعترف بذنبه كمن لا ذنب له) ئینجا هەولی پاك کردنەوەی نیشانەکانت لەو دووکەڵە پیسەو پڕ مەترسیە بدەو، بە کردەوەی پاکت سیای و تەپو تۆزو گەردی جگەرە لەسەر دڵ و دەروونی خۆت و هاوولاتیانت بڕەوێنە، چونکە یەکێك لە مەرجەکانی تەوبەی ڕاست ئەوەیە کە تاوانەکانی پێشوو بوترێن و دانیان پێدا بنرێت ﴿الاّ الذين تابوا وأصلحوا وبيّنوا فاولئك أتوب عليهم وانا التواب الرحيم﴾(البقرة: ١٦٠).

واتە (نەفرینی ئێمە لەو کەسانەیە کە شتی ڕاست و دروستی ئایین ئەشارنەوە) مەگەر کەسانێك کە پەشیمان ببنەوەو ئیشی چاك بکەن و بەیانی ئەو شتە ئەوتراوەی پێشوو بکەن. (خوای گەورە ئەفەرموێت) ئا لەوانە ئێمە تەوبەو پەشمان بوونەوەیان لێ وەرئەگرین و، من زۆر پەشیمان بوونەوە وەرئەگرم و زۆر بە بەزەییم.

خوێنەری بەڕێز! تەماشای میهرەبانیو بەخشندەیی و سۆزی خوای گەورەو زاناکە، چ ئیحتیاجێکی بە ئێمە هەیە ئەم هەموو ئامۆژگاری و نەسیحەتەمان ئەکات؟؟ وە ئایا فرمانەکانی خوا هەمووی لەبەر بەرژەوەندی خەڵك نییە؟ وە ئایا ئەو هەموو

نیعمەتانە هەر لەچاوو گوێو ژیریو بگرە تا خۆراکو و پۆشاک ئاوو هەوا هی ئەو زاتە نییە کە بە ئەمانەت لەبەر دەستی ئێمەدا دایناوە؟؟

وە ئایا ئەو شتانەی کە بەناو بەندایەتیو پەرستنەوە بەناو بانگن هەموویان بۆ سوودو بەرژەوەندی خۆمان نییە؟؟!! دەی خۆت و ویژدانت لادان لەو یاسایە بەڵگەی نەزانیو نەفامی نییە؟؟!! چونکە تا زیاتر زاناو شارەزاتر بیت چاکتر قازانج و سوودی ئەو یاسایە ئەزانیت ﴿**هل يستوي الذين يعلمون والذين لا يعلمون؟؟**﴾(الزمر: ٩).

واتە ئایا زاناو نەزانەکان وەکو یەک وان؟؟ دەی ئایا جێگای سەر سوڕمان نییە بەخوا نەناسان بووترێت ڕۆشنبیر؟!!!

دیارە ئەم قسەی ئێمە تاڵە لەلای خۆ بەڕۆشنبیر زانان، ئەمما لە تاڵی جگەرە تاڵتر نییە. ئەگەر جگەرە بەرەو بێ ئاگاییو لەبەین چونیان ئەبات؟! خۆ ئێمە بەرەو ئاگاییو ژیانێکی خوا پەسەندانەو مرۆڤ دۆستانەو پاک و بێ دووکەڵیان ئەبەین. برام، بۆ شتی وایە پێشینە ئەڵێ: دۆست ئەوەیە بتگرێنێو دوژمن ئەوەیە بتکەنێنێ.

# پارێزگاری لە لەش و تەندروستی پێویستە

خوای زاناو خاوەن دەسەلات و نیعمەت فەروان ئەوەندە نیعمەتی بەسەر سەر مرۆڤدا ڕژاندووە لە ژمارە نایەن ﴿وإن تعدوا نعمة الله لا تحصوها ان الله لغفور رحيم﴾(النحل:١٨) واتە ئەگەر ئێوە بتانەوێ نیعمەتەکانی خوا بژمێرن، ناتوانن بیان ژمێرن. بەڕاستی خوا بەزۆری لە تاوان خۆش ئەبێت و زۆر میهرەبانە. ئەرکی سەرشانی هەموو مرۆڤێکی ژیرو خواناسە، بە گوێرەی توانا سوپاسی خوای گەورە بکات و، بۆ هەڵەو پەڵەو تاوانەکانی داوای لێ خۆشبوونی لێ بکات و ناسوپاس نەبێت ﴿لئن شكرتم لأزيدنكم ولئن كفرتم انّ عذابي لشديد﴾. جا ئەو کەسانەی کە گوێ بە نیعمەتەکانی خوا نادەن و سپڵەو بێ نمەکن و بە پێچەوانەی یاسای ئیسلامەوە ئەجولێنەوە شایستەیە دووچاری سەخت ترین بەلاو گەورەترین تەنگ و چەڵەمەی ئەم ژیانە بێن. لەش و تەندروستی دوو نیعمەتی زۆر بەنرخن لە نیعمەتە

فەرەوانەکانی خوای گەورە پێویستە ڕێزیان لێ بگرین. واتە پێویستە ئەو شتانە ئەنجام بدەین کە ئەبنە هۆی بەهێز بوونی لەش و تەندروستیو، خۆمان دوور بگرین لەو شتانەی کە ئەبێتە هۆی زیان پێگەیاندنیان. کەوا بوو پێویستە هەموو بەندایەتیيەکانی خوا ئەنجام بدرێن، چونکە هەموویان ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ سوودیان بۆ لەش و تەندروستی هەیە. بۆ نموونە پێغەمبەری مەزن ﷺ ئەفەرموێت (صوموا تصِحّوا) وە (السواك مطهرة للفم مرضاة للربّ) وە خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ان صلاتك سكن لهم﴾و.. و... هتد. وە بۆ پارێزگاری لەش لە سەرماو گەرما لیباس پۆشین پێویستە. هەروەها لە کاتی هەستی لاوازیو نەخۆشی پێویستە سەر لە پزیشک بدرێت و تیماری نەخۆشیەکان بکرێت. پێغەمبەری پایە بەرز ئەفەرموێت (تداووا عباد الله فان الله لم يضع داءً الاّ وضع له دواءً) واتە ئەی بەندەکانی خوا تیماری نەخۆشیەکانتان بکەن بەڕاستی خوا هیچ بیمارییەکی دانەناوە مەگەر دەرمانیشی بۆ دانابێ. هەروەها ئیسلام بەهێزی لەش و تەندروستی کردووە بە مەرجێک لە مەرجەکانی بە فرماندەبوون و ئەفەرموێت: ﴿...إنّ الله اصطفاه عليكم وزاده بسطة في العلم والجسم﴾ واتە بەڕاستی خوا ئەوی کردووە بە سەرپەرشتی ئێوەو

زیادە هێزێکی پێداوە لە بارەی زانین و لەشەوە. بەڵێ، پارێزگاری لەش و تەندروستی پێویستە تا مرۆڤ چاکتر بتوانێت پێویستیەکانی تری ئەنجام بدات، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێت (المؤمن القوي خير وأحب الى الله من المؤمن الضعيف) واتە باوەڕداری بەهێز چاکترو خۆشەویست ترە لەلای خوا لە باوەڕداری لاواز. جا ئەو بەهێزو بێ هێزیە چ دەربیڕو چ ناو پەیوەندیان هەیە بە یەکترەوە وەکو وتراوە «ژیری ساغ لە لەشی ساغ دایە» ((العقل السليم في الجسم السليم)) بەڵگە لەم بارەوە زۆرە بەڵام لە عاقڵان ئیشارەتێک بەسە. ئینجا سەرنجێکی ژیرانە لە جگەرە بدەو بزانە ئایا زیانی بۆ لەش نیە؟؟ ئەگەر نیەتی، ئەوە ئەم تیرەمان نەپێکاوە بەڵام خۆ ئەوانەی کە ئێمە هەمیشە بۆ هەموو نەخۆشیەکانمان ئەچینە لایان واتە پزیشکەکان هەموویان یەک قسەن لە زیانی جگەرەدا، تەنانەت ئەوەندە زیانەکەی ئاشکرایە پێویستیان کردووە لەسەر زۆربەی کارخانەکانی جگەرەسازی جیهان، کە هەندێ لەو زیانانە لەسەر پاکەتی جگەرەکان بنووسن، ئەمەش دەقی ئەو نووسینەیە ((جگەرە هۆیەکی سەرەکیە بۆ نەخۆشی شێرپەنجە -السرطان- و

نەخۆشـیـیەكانی سـی -السـل-و نەخۆشـیـیەكانی دڵ و دەمـــار)).
ئەوەی شایانی باسە ئەم نووسینەم لەسەر پاكەتێك كەوتە بـەر چـاو كە لە داوێنی ئەو پاكەتەوە نووسـرابوو (ئـەم جگـەرە لـە چاكـترین توتن و بە ڕێگایەكی تازەترو پێشكەوتوو تر دروست كـراوە!!) ئیـتر جگەرە هەرەمەیییەكان ئەبێ چۆن بێت؟؟!! كەوابوو جگەرە شـتێكی زۆر زیـان هێنـەرەو ناپەسـەندو پیسـەو هـەموو شـتێكی پیسـیش خواردنی حەرامە تەماشاكە خوای گـەورە لـە وەسـفی پێغەمبـەری پایە بەرزداﷺ ئەفەرموێت: ﴿...يأمرهم بـالمعروف وينهاهم عـن المنكـــر ويحـــلّ لهـــم الطيبـــات ويحـــرم عليهـــم الخبائث﴾(الاعراف:١٥٧).

واتـە، موحەممـەد فرمانیـان پـێ ئـەكات بـە چاكـە كـردن و بـەرگریان ئـەكات لـە خراپـەو پاكـەكانیان بـۆ حـەلاڵ ئـەكات و پیسەكانیان لێ قەدەغە ئەكات. جا ئیتر كەی ژیرانەیە تۆ خۆت بـە دەستی خۆت ئـاوا زیـان بـە لـەش و تەندروسـتی خـۆت بدەیـت؟؟!! زانایان ئــەڵێن ((ويحرم تنـاول مـا يضـرّ البـدن)) حەرامـە بـەكار هێنانی ئەو شتانەی كە زیانیان هەیە بۆ لەش.

((مغني المحتاج ج/٤ ل٣٠٦))

بەگوێرەی ئەم زیانـە ئاشـكرانەی جگـەرەو بـە گوێـرەی وەسـفی

پێغەمبەر لە ئایەتی سەرەوەو بە گوێرەی ئەم فتوای زانایانە لەم بارەیشەوە جگەرە بە حەرام دەرچوو، دیسان بە گوێرەی فتوای زانایان خۆڵ خواردن و شیشە خواردن و ئاگر خواردن و مارگرتن و زەهر خواردن حەرامە چونکە زیانیان هەیە بۆ لەش، دەی چۆن جگەرە حەرام نیێە؟؟!! ڕۆژووی دوو ڕۆژ بەبێ شت خواردن لە شەودا چونکە زیانی هەیە بۆ لەش ناڕەواو قەدەغەیە، دەی چۆن جگەرە لەگەڵ ئەو هەموو زیانانەدا کە باسکران ناڕەواو قەدەغە نیێە؟؟!!

جا زیانی دوو ڕۆژ ڕۆژوو لەکوێو زیانی جگەرە لەکوێ؟! کاکی موسڵمان خۆت مەخەڵەتێنە قسە هەزارە دووی بەکارە ﴿**فبشر عباد الذين يستمعون القول فيتبعون احسنه أولئك الذين هداهم الله وأولئك هم أولوا الألباب**﴾(الزمر:١٨-١٧).

واتە، ئەی موحەممەد ﷺ مژدە بدە بەو بەندانەی من کە گوێ لە قسە ئەگرن و لە پاشا، واتە: دوای هەڵسەنگاندنیان و جیا کردنەوەی چاک لە خراپی، پەیڕەوی لە قسە چاکەکان ئەکەن، ئەوانە کەسانێکن کە خوا ڕێنموونی کردوون، وە ئەوانە خاوەنیی ژیری و عەقڵن.

# بۆ جگەرە نەتکات بە موشریک؟!!!

کاکی سیگاری ئەگەر خۆت بە موسڵمان ئەزانیت وریا بە جگەرە نەتکات بە موشریک و هاوەڵ دانەر بۆ خوای تاک و تەنیا ؟!! برام جگەرە بۆ گیان و لەش و ماڵ، بۆ خۆت بۆ خەڵک زیانی ئاشکرایە. نەڵێیت من ئارەزووم لێیەتی و پێم خۆشەو بۆ خۆشی ئەیکێشم و ماڵی خۆمە!!

هەر شتێک زیانی هەبێت لە یاسای ئیسلامدا حەرام کراوە هەروەها ئیسلام نەفس رازی کردنی نەک پێ خۆش نی یە بەڵکو داوا لە مرۆڤ ئەکات کە هەوڵی پاک کردنەوەی نەفسی بدات و پەیڕەوی لە ئارەزۆکانی نەکات. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قد أفلح من زكيها وقد خاب من دسيها﴾(الشمس:٩-١٠).

واتە: بەڕاستی ڕزگارە ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی پاک ئەکاتەوە لە ئارەزووات و، ڕەنجەڕۆیە ئەو کەسەی کە دەست بۆ نەفسی خۆی شل ئەکات. هەروەها خوای زاناو کاربەجێ،

سەرزەنشتی ئەو کەسانە ئەکات کە پەیڕەوی لە نەفس و ئارەزوواتی خۆیانەوە ئەکەن و ئەفەرموێت: ﴿أفرأيت من اتخذ الهه هواه وأضله الله على علم وختم على سمعه وقلبه وجعل على بصره غشاوة فمن يهديه من بعد الله أفلا تذكرون؟﴾(الجاثية:٢٣).

واتە: ئایا نابینیت ئەو کەسەی کە ئارەزۆکانی خۆی کردووە بەخوای خۆیو خوایش لەسەر زانینی خۆیو ڕوناکی بیرو زانینی، ئەو ڕێگای لێ ون کردووەو مۆری ناوە بەسەر گوێچکەو دڵیاو پەردەی ڕەشی داناوە لەسەر چاوی، وە کێ هەیە بێجگە لەخوا ڕێنمونی ئەو کابرایە بکات؟ ئایا بیر ناکەنەوە؟! بەڵێ پیاو چاکان هەمیشە نەفسی خۆیان بە دوژمنێکی گەورە زانیوەو، تەنانەت لە ئامۆژگاری خێریشا لێی کەوتونەتە گومانەوە. ئەڵێن پیاو چاکێک چل ساڵ خورمای نەخواردووە چون وتویەتی نەفسم زۆری حەز لێ بووە. پیاو چاکێکی تر ئەڵێت: نەفسم زۆر حەزی لە جیهاد ئەکرد منیش سەرم سوڕما، چۆن و لەبەرچی نەفسم ئەوەندە حەز لەو ئیشە گەورەو بەنرخە ئەکات لەپاش ڕاو وشکانێکی خۆم بۆم دەرکەوت کە نەفسی فێڵباز ئارەزۆی ناوو شورەت ئەکات!!

براو خوشکە موسڵمانەکان نەفس دوژمنەو ئەبێ ئاگاتان لە

# بۆ جگەرە نەتکات بە موشریک؟!!!

کاکی سیگاری ئەگەر خۆت بە موسڵمان ئەزانیت وریا بە جگەرە نەتکات بە موشریک و هاوەڵ دانەر بۆ خوای تاک و تەنیا؟!! برام جگەرە بۆ گیان و لەش و ماڵ، بۆ خۆت بۆ خەڵک زیانی ئاشکرایە. نەڵێیت من ئارەزووم لێیەتی و پێم خۆشەو بۆ خۆشی ئەیکێشم و ماڵی خۆمە!!

هەر شتێک زیانی هەبێت لە یاسای ئیسلامدا حەرام کراوە هەروەها ئیسلام نەفس رازی کردنی نەک پێ خۆش نیە بەڵکو داوا لە مرۆڤ ئەکات کە هەوڵی پاک کردنەوەی نەفسی بدات و پەیڕەوی لە ئارەزۆکانی نەکات. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قد افلح من زكيها وقد خاب من دسيها﴾(الشمس:٩-١٠).

واتە: بەڕاستی ڕزگارە ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی پاک ئەکاتەوە لە ئارەزووات و، ڕەنجەڕۆیە ئەو کەسەی کە دەست بۆ نەفسی خۆی شل ئەکات. هەروەها خوای زاناو کاربەجێ،

سەرزەنشتی ئەو کەسانە ئەکات کە پەیڕەوی لە نەفس و ئارەزوواتی خۆیانەوە ئەکەن و ئەفەرموێت: ﴿أفرأيت من اتخذ الهه هواه وأضله الله على علم وختم على سمعه وقلبه وجعل على بصره غشاوة فمن يهديه من بعد الله أفلا تذكرون؟﴾(الجاثية:٢٣).

واتە: ئایا نابینیت ئەو کەسەی کە ئارەزۆکانی خۆی کردووە بەخوای خۆیو خوایش لەسەر زانینی خۆیو ڕوناکە بیرو زانینی، ئەو ڕێگای لێ ون کردووەو مۆری ناوە بەسەر گوێچکەو دڵیاو پەردەی ڕەشی داناوە لەسەر چاوی، وە کێ هەیە بێجگە لەخوا ڕێنمونی ئەو کابرایە بکات؟ ئایا بیر ناکەنەوە؟! بەڵێ پیاو چاکان هەمیشە نەفسی خۆیان بە دوژمنێکی گەورە زانیوەو، تەنانەت لە ئامۆژگاری خێریشا لێی کەوتونەتە گومانەوە. ئەڵێن پیاو چاکێك چل ساڵ خورمای نەخواردووە چون وتویەتی نەفسم زۆری حەز لێ بووە. پیاو چاکێکی تر ئەڵێت: نەفسم زۆر حەزی لە جیهاد ئەکرد منیش سەرم سوڕما، چۆن و لەبەرچی نەفسم ئەوەندە حەز لەو ئیشە گەورەو بەنرخە ئەکات لەپاش ڕاو وشکانێکی خۆم بۆم دەرکەوت کە نەفسی فێڵباز ئارەزۆی ناوو شورەت ئەکات!!

براو خوشکە موسڵمانەکان نەفس دوژمنەو ئەبێ ئاگاتان لە

خۆتان بی (انّ أعدی عدوك نفسك بین جنبیك)[5].

بــراو خوشــكه خواناســه‌كان! نــه‌فس هــانده‌ری مرۆڤــه بــۆ ئه‌نجامدانی ئیشی نــاڕه‌واو ناپه‌ســه‌ند. خــوای گــه‌وره ئه‌فــه‌رموێت: ﴿ان النفــس لأمــارة بالســوء﴾[6] واتــه: به‌ڕاســتی نــه‌فس هه‌میشــه هانده‌رو فه‌رمانده‌ره به ئیشی خراپ.

خوای گه‌وره هه‌مووومان له شــه‌ڕی نــه‌فس بپــارێزێت. خوێنــه‌ری به‌ڕێز په‌یڕه‌وی كردن له نه‌فس پشت گوێ خســتنی فرمــانی خوایــه، واته ئه‌گه‌ر موسڵمان بیت ئه‌بی به موشریك و هاوه‌ڵ دانه‌ر بۆ خوا. چونكــه لــه‌باتی پــه‌یڕه‌وی كردنــی ڕێبــازی خــواو ئــه‌نجامدانی فرمانــه‌كانی پــه‌یڕه‌وی لــه ڕچــه‌و ڕێبازه‌كــانی نه‌فســت ئه‌كــه‌یت و خه‌ریكی ئه‌نجامدانی ئاره‌زۆكانی نه‌فستیت؟، جگــه‌ره یه‌كێكــه لــه ئــاره‌زۆ نه‌فســیه‌كانت و پێویســته لــه ده‌ســتی ڕاكــه‌یت، ئــه‌گینا لــه تاریكایی دووكه‌ڵه‌كه‌یه‌وه ئه‌تخاته ناو چاڵی به‌دبه‌ختی‌و چاره‌ڕه‌شــی شیركه‌وه، وریا به قه‌ت توخنی نه‌كه‌ویت.

---

[5] واته: له هه‌موو دوژمنێ دوژمن تڕت نه‌فسی نێوان دوو ته‌نشته.

[6] یوسف:٥٢.

# زیانی جگەرە هەموو کون و قوژبنێک ئەگرێتەوە!!

جگەرەکێش دووکەڵ کەرەو خاوەن دووکەڵ کەی بێ زیانە؟ پێشینە وتوویانە ((یاخوا کەس نەبێ بە دووکەڵ)) جگەرەکێش زیاندەرە لە هەموو کەس:

یەکەم: زیاندەرە لە هاوسەری ،چ پیاو چ ژن».

دووهەم: زیاندەرە لە منداڵەکانی، چونکە ئەوان ناسکترن زووتر دووچاری نەخۆشی سیل و سەرەتان و نەخۆشییەکانی دڵ و دەمار ئەبن، تەنانەت ئەگەر ئافرەتی باردار (حامل) جگەرە بکێشێ زیان گەیەنەرە بە منداڵەکەی ناو سکی، ئەتوانن لەم بارەوە پرسیار لە پزیشکە شارەزاکان بکەن (ئەوە گەزو ئەو بان).

سێهەم: جگەرە کێش زیاندەرە لەو کەسانەی کە لە نزیکیدا هەن بە تایبەت ئەگەر لە شوێنی سەر بەسراودا وەکو سەیارەو هودەدا، بکێشرێت ئەوە زیانەکەی سەدا سەدە بۆ هەموان واتە هەموویان تووشی زیان ئەبن.

خۆتان بی (انّ أعدی عدوك نفسك بین جنبیك)[٥].

بـراو خوشـکه خواناسـەکان! نـەفس هـاندەری مرۆڤـە بـۆ ئەنجامدانی ئیشی نـاڕەواو ناپەسـەند. خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿ان النفـس لأمـارة بالسـوء﴾[٦] واتـە: بەڕاسـتی نـەفس هەمیشـە هاندەرو فەرماندەرە بە ئیشی خراپ.

خوای گەورە هەموومان لە شـەڕی نـەفس بپـارێزێت. خوێنـەری بەڕێز پەیڕەوی کردن لە نەفس پشت گوێ خسـتنی فرمـانی خوایـە، واتە ئەگەر موسڵمان بیت ئەبی بە موشریك و هاوەڵ دانەر بۆ خوا. چونکـە لـەباتی پـەیڕەوی کردنـی ڕێبـازی خـواو ئـەنجامدانی فرمانـەکانی پـەیڕەوی لـە ڕچـەو ڕێبازەکـانی نەفسـت ئەکـەیت و خەریکی ئەنجامدانی ئارەزۆکانی نەفستیت؟، جگـەرە یەکێکـە لـە ئـارەزۆ نەفسـیەکانت و پێویسـتە لـە دەسـتی ڕاکەیت، ئـەگینا لـە تاریکایی دووکەڵەکەیەوە ئەتخاتە ناو چاڵی بەدبەختیو چارەڕەشـی شیرکەوە، وریا بە قەت توخنی نەکەویت.

---

[٥] واتە: لە هەمرو دوژمنێ دوژمن ترت نەفسی نێوان دوو تەنشتتە.

[٦] یوسف:٥٢.

# زیانی جگەرە هەموو کون و قوژبنێک ئەگرێتەوە!!

جگەرەکێش دووکەڵ کەرەو خاوەن دووکەڵ کەی بێ زیانە؟ پێشینە وتوویانە ((یاخوا کەس نەبێ بە دووکەڵ)) جگەرەکێش زیاندەرە لە هەموو کەس:

یەکەم: زیاندەرە لە هاوسەری ،چ پیاو چ ژن،.

دووهەم: زیاندەرە لە منداڵەکانی، چونکە ئەوان ناسکترن زووتر دووچاری نەخۆشی سیل و سەرەتان و نەخۆشیەکانی دڵ و دەمار ئەبن، تەنانەت ئەگەر ئافرەتی باردار (حامل) جگەرە بکێشێ زیان گەیەنەرە بە منداڵەکەی ناو سکی، ئەتوانن لەم بارەوە پرسیار لە پزیشکە شارەزاکان بکەن (ئەوە گەزو ئەو بان).

سێهەم: جگەرە کێش زیاندەرە لەو کەسانەی کە لە نزیکیدا هەن بە تایبەت ئەگەر لە شوێنی سەر بەسراودا وەکو سەیارەو هودەدا، بکێشرێت ئەوە زیانەکەی سەدا سەدە بۆ هەموان واتە هەموویان تووشی زیان ئەبن.

چوارەم: زیاندەرە لە لەش و تەندروستی خۆی و خەڵک.

شەشەم: زیاندەرە لە سەروەت و سامانی گشتیی بەهۆی ئەو نەخۆشیانەوە کە جگەرە کێش ئەبێ بەهۆی بڵاو بوونەوەی، بە کورتی، بونی جگەرە زەرەرەو، زانیان هاوقسەن لەوەدا کە (الضرر یُزال) زیان لادەبرێت و ئەڵێن: (دفع الضرر مقدم علی جلب المنفعة) لابردنی زیان پێش هێنانی سوودە. وە ئەڵێن: (ومن فروض الکفایات دفع ضرر المعصومین) مغني ج٤ ل٢١٢.

بەشێکە لە فەرزە کیفایەتەکان، لابردن و بەرگری لە زیانی بێ تاوانان[٧] خۆ جگەرە هەموو گیانی هەر زیانە بە تایبەت بۆ بێ تاوانترین شت کە منداڵە زیاترو کاریگەرترە، دەی چۆن قەدەغەو حەرام نییە؟!!

بەڕاستی جێگای سەر سوڕمانە بۆ ئەوانەی کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەناسن و سەبارەت بە حەرام بوونی جگەرە لە دڵ ڕاوکێدا بن!! ئەوانەی کە ئیسلام و بەرنامەکەی و سوودی ئایین نازانن لەم بارەوە زۆر جێگای گلەیی نین. کاکی سیگاری! زۆر جار خەڵکت

---

[٧] مەبەست لە بێ تاوان ئەو کەسەیە کە مردنی پێویست نەکرابێ لەلایەن ئاینەوە وەک (مورتەد/ پاشگەز بوونەوە لە دین) ئەوە هەر زیانێ ڕووی تێ کات پێویست نیە لابرێت.

هەڵۆگیری نەخۆشی جۆراو جۆر کردووەو بەخۆتت نەزانیوە بەڵام خوا ئاگای لە هەموو شتە، جگەرە کێش مومکینە لای کەم قەتڵێکی تووش بووبێ، چونکە زۆر جار لەناو سەیارەدا جگەرەکێش بە کەللەبایی ئاگری لە توتن بەرداوەو خەڵکی ناو سەیارەی دۆداوە، گەلێکی زۆریشی بەو دووکەڵە بەرەو بیمارستان و نەخۆشخانەکان ناردووەو هەندێکیشی دووچاری ڕشانەوەو قەی قوڵپ کردووە، وە جاری وایش بووە لەو تێکچووانە ئافرەتیی سکێ پڕ بووە کە بەهۆی ئەو تێکچوون و قەیو قوڵپەوە سکەکەی فڕە داوە، جا کاکی جگەرکێش کێ بوو بەهۆی کوشتنی ئەو منالە؟ ئەی تۆ نەبویت؟! دەی بۆ ئەو خەڵکە مافیان نییە بە جەنابت بڵێن جگەرە مەکێشە؟!

بەڕاستی ئەگەر ئەو خەڵکە غیرەتیان هەبێت خوێنی ئەو منالە بێ تاوانەت لێ ئەسێنن، ئەی منالە ساواکان چ تاوانێکیان هەیە کە تۆ دووچاری سیل و سەرەتان و نەخۆشی دڵ و دەروونیان ئەکەیت؟ کاکی سیگاری خۆت و ویژدانت تۆ میکرۆب نیت؟ ئایا کام میکرۆب شک ئەبەیت کە لە خۆت زیان هێنەرتر بێت؟ زۆربەی میکرۆبەکان یەک یا دوو نەخۆشی بڵاو ئەکەنەوە لەگەڵ ئەوەشدا

چوارەم: زیاندەرە لە لەش و تەندروستی خۆی و خەڵک.

شەشەم: زیاندەرە لە سەروەت و سامانی گشتیی بەهۆی ئەو نەخۆشیانەوە کە جگەرە کێش ئەبێ بەهۆی بڵاو بوونەوەی، بە کورتی، بونی جگەرە زەرەرەو، زانایان هاوقسەن لەوەدا کە (الضرر يُزال) زیان لادەبرێت و ئەڵێن: (دفع الضرر مقدم على جلب المنفعة) لابردنی زیان پێش هێنانی سوودە. وە ئەڵێن: (ومن فروض الكفايات دفع ضرر المعصومين) مغني ج٤ ل٢١٢.

بەشێکە لە فەرزە کیفایەتەکان، لابردن و بەرگری لە زیانی بێ تاوانان[٧] خۆ جگەرە هەموو گیانی هەر زیانە بە تایبەت بۆ بێ تاوانترین شت کە منالە زیاترو کاریگەرترە، دەی چۆن قەدەغەو حەرام نی‌یە؟!!

بەڕاستی جێگای سەر سوڕمانە بۆ ئەوانەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەناسن و سەبارەت بە حەرام بوونی جگەرە لە دڵ ڕاوکێدا بن!! ئەوانەی کە ئیسلام و بەرنامەکەی و سوودی ئایین نازانن لەم بارەوە زۆر جێگای گلەیی نین. کاکی سیگاری! زۆر جار خەڵکت

[٧] مەبەست لە بێ تاوان ئەو کەسیە کە مردنی پێویست نەکرابێ لەلایەن ئایینەوە وەک (مورتەد/ پاشگەز بوونەوە لە دین) ئەوە هەر زیانێ ڕووی تێ کات پێویست نیە لابرێت.

هەڵۆگیری نەخۆشی جۆراو جۆر کردووەو بەخۆتت نەزانیوە بەڵام خوا ئاگای لە هەموو شتە، جگەرە کێش مومکینە لای کەم قەتڵێکی تووش بووبێ، چونکە زۆر جار لەناو سەیارەدا جگەرەکێش بە کەللەبایی ئاگری لە توتن بەرداوەو خەڵکی ناو سەیارەی دۆداوە، گەلێکی زۆریشی بەو دووکەڵە بەرەو بیمارستان و نەخۆشخانەکان ناردووەو هەندێکیشی دووچاری ڕشانەوەو قەی قوڵپ کردووە، وە جاری وایش بووە لەو تێکچووانە ئافرەتیی سکێ پڕ بووە کە بەهۆی ئەو تێکچوون و قەیو قوڵپەوە سکەکەی فڕە داوە، جا کاکی جگەرکێش کێ بوو بەهۆی کوشتنی ئەو منالە؟ ئەی تۆ نەبویت؟! دەی بۆ ئەو خەڵکە مافیان نی یە بە جەنابت بڵێن جگەرە مەکێشە؟!

بەڕاستی ئەگەر ئەو خەڵکە غیرەتیان هەبێت خوێنی ئەو منالە بێ تاوانەت لێ ئەسێنن، ئەی منالە ساواکان چ تاوانێکیان هەیە کە تۆ دووچاری سیل و سەرەتان و نەخۆشی دڵ و دەروونیان ئەکەیت؟ کاکی سیگاری خۆت و ویژدانت تۆ میکرۆب نیت؟ ئایا کام میکرۆب شکێ ئەبەیت کە لە خۆت زیان هێنەرتر بێت؟ زۆربەی میکرۆبەکان یەکێ یا دوو نەخۆشی بڵاو ئەکەنەوە لەگەڵ ئەوەشدا

زۆربەی دەرمانخانەکانی جیهان پڕە لە دەرمانی دژیان، خۆ تۆ میکرۆبی دەیان نەخۆشیت، سادەکەیان نەخۆشی سیل و دەمارە، دەی دەرمانی دژی تۆ بۆ نەبێت؟!!

خوێنەری بەڕێز، ئێمە نامانەوێ لە باسە پزیشکیەکانەوە بدوێین چونکە ئەو بوارەیش مەلەوانی خۆی هەیە، ئێمە تەنها بۆ نموونە ئەو شتانەمان باس کرد، هیواداریـن برا پزیشکەکانیشمان هەروەک چۆن زۆر شتیان لەم بارەوە لێرەو لەوێ وتووە، پەڕاوێکی تایبەت لەم بارەوە بلاو کەنەوەو ئەرکی سەرشانیان لەم بارەیشەوە ئەنجام بدەن ﴿وما على الرسول الاّ البلاغ﴾.

خوێنەری بەڕێز! لەم کورتە باسەدا زیانی گشتیو هەموو گیری جگەرەت بۆ ڕوون کراوە، ئیتر خۆت و خوای خۆت. چۆن خۆت ڕازی ئەکەیت کە خۆت بەو میکرۆبە پیسە بکەیت و گەل دووچاری ئەو هەموو ئێش و ئازارە بکەیت؟!!

تێبینی:

* زۆر جێگای سەر سوڕمانە ئەوانەی کە خۆیان بە شارەزا لە ئایین یان بە شارەزا لە زانستی پزیشکی یان خۆیان بە ڕۆشنبیر

ئەزانن خواردن و خواردنەوەو قسەکردن و هەتا هەناسە دانی زۆریان بەلاوە نارەوایە لە ناودەستدا -ئەمە شتێکی چاکەو زۆر پەسەندە- کەچی جگەرەکێشان لەو شوێنەدا باوبانە!! تۆ بڵێیت تالی و ژاری جگەرەکە ئەو میکرۆبانەی ناودەستیش لەناو بەرێت؟!! برام ئەگەر وایش بێ!! ئینجا قسەی پێشینان رێک ئەکەوێ کە ئەڵێن: (خۆی پیس کردووەو بەمیز ئەیشۆرێ) میکرۆب زیاندەرەو جگەرە دەبڵ زیاندەرە؟!

پێغەمبەری مەزنﷺ وەختی دەست بەناو ئەنگوستیلەکەی ئەخستە دەمی و وەلامی سەلامی نەئەدایەوە تا لە زیادە هەڵمژینی هەوای ئەو شوێنە بپارێزرێت، جا ئەوە لە کوێ و جگەرە هەڵمژین لەکوێ لەو شوێنە میکرباوییەدا ؟!!.

* جگەرە لە گیایەک دروست ئەکرێت بەناو (توتن تەماکو/ التبغ)ە، ئەم گیایە لە جەزیرەی تاباغۆی مەکسیکی ئەمریکاوە هاتووەتە ئەسپانیاو، لەوێوە لەناو ولاتی ئیسلامیدا بلاو بووتەوەو، لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا کاتێ خەبەر بە خەلیفە درا لە ئەستانبول، کە لە میسرا ئەو توتنە کراوە، دەستوری دا هەموویان هەڵگیرایەوەو زانایانی ئەو سەردەمە بە حەرامیان دانا. بەلام

زۆربەی دەرمانخانەکانی جیهان پڕە لە دەرمانی دژیان، خۆ تۆ میکرۆبی دەیان نەخۆشیت، سادەکەیان نەخۆشی سیل و دەمارە، دەی دەرمانی دژی تۆ بۆ نەبێت؟!!

خوێنەری بەڕێز، ئێمە نامانەوێ لە باسە پزیشکیەکانەوە بدوێین چونکە ئەو بوارەیش مەلەوانی خۆی هەیە، ئێمە تەنها بۆ نموونە ئەو شتانەمان باس کرد، هیواداریـن برا پزیشکەکانیشمان هەروەک چۆن زۆر شتیان لەم بارەوە لێرەو لەوێ وتووە، پەڕاوێکی تایبەت لەم بارەوە بڵاو کەنەوەو ئەرکی سەرشانیان لەم بارەیشەوە ئەنجام بدەن ﴿وما على الرسول الاّ البلاغ﴾.

خوێنەری بەڕێز! لەم کورتە باسەدا زیانی گشتیو هەموو گیری جگەرەت بۆ ڕوون کراوە، ئیتر خۆت و خوای خۆت. چۆن خۆت ڕازی ئەکەیت کە خۆت بەو میکرۆبە پیسە بکەیت و گەل دووچاری ئەو هەموو ئێش و ئازارە بکەیت؟!!

تێبینی:

* زۆر جێگای سەر سوڕمانە ئەوانەی کە خۆیان بە شارەزا لە ئایین یان بە شارەزا لە زانستی پزیشکی یان خۆیان بە ڕۆشنبیر

ئەزانن خواردن و خواردنەوەو قسەکردن و هەتا هەناسە دانی زۆریان بەلاوە نارەوایە لە ناودەستدا -ئەمە شتێکی چاکەو زۆر پەسەندە- کەچی جگەرەکێشان لەو شوێنەدا باویانە!! تۆ بڵێیت تاڵیو ژاری جگەرەکە ئەو میکرۆبانەی ناودەستیش لەناو بەرێت؟!! برام ئەگەر وایش بێ!! ئینجا قسەی پێشینان رێک ئەکەوێ کە ئەڵێن: (خۆی پیس کردووەو بەمیز ئەیشۆرێ) میکرۆب زیاندەرەو جگەرە دەبڵ زیاندەرە؟!

پێغەمبەری مەزن ﷺ وەختێ دەست بەناو ئەنگوستیلەکەی ئەخستە دەمیو وەلامی سەلامی نەئەدایەوە تا لە زیادە هەڵمژینی هەوای ئەو شوێنە بپارێزرێت، جا ئەوە لە کوێو جگەرە هەڵمژین لەکوێ لەو شوێنە میکرباوییەدا؟!!.

* جگەرە لە گیایەک دروست ئەکرێت بەناو (توتن تەماکو/ التبغ)ە، ئەم گیایە لە جەزیرەی تاباغۆی مەکسیکی ئەمریکاوە هاتووەتە ئەسپانیاو، لەوێوە لەناو وڵاتی ئیسلامیدا بڵاو بووتەوەو، لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا کاتێ خەبەر بە خەلیفە درا لە ئەستانبول، کە لە میسرا ئەو توتنە کراوە، دەستوری دا هەموویان هەڵگیرایەوەو زانایانی ئەو سەردەمە بە حەرامیان دانا. بەلام

بەداخەوە کەم کەم لەناو خەڵکا وەکو باقی تاوانەکانی تر پەرەی سەندو، پیاوو ژن و عالم و عەوامی گرتەوەو، ئیتر بێ دەنگەی لێ کراو، گەلی ئێمەش وەکو باقی گەلان کەوتە ئەو داوە پیسەو، بێجگە لە تاق تاقێ زانا نەبێت کە خوا پاداشتیان بداتەوە هەر باسیان نەکردووە.

# جگەرەکێش ئەبێ خۆی لە کۆمەڵ دوور خاتەوە!!

کاکی موسڵمان! کاتێ کە ئەو هەموو زیانانەت سەبارەت بە جگەرە کێشان زانی‌و هەر بەردەوام بویت لە سەری‌و نەئایین و نەویژدان و نەژیری کاری تێ نەکردیت، ئینجا پێویستە وەک ئەرکێکی ئایینی‌و کۆمەڵایەتی‌و تەندروستی ئەم چەند شتەت لەگەڵدا ئەنجام بدرێت:

یەکەم: جگەرەکێش ئەبێ لە تێکەڵاوبوونی خەڵک بەرگری کرێت لەبەر ئەم هۆیانە:

أ- لەبەر سەلامەتی‌و پاراستنی خەڵک لە نەخۆشی چونکە جگەرەکێش وەک لە پێشەوە باسمان کرد هەڵگری میکرۆبی چەندین نەخۆشی واگیرە کە یەکێکیان سیلەو، بلاوکەرەوەی چەندین دەردی بێ دەرمانی ترە بەهۆی دووکەڵی جگەرەکەیەوە، وەک نەخۆشی شێرپەنجە (سەرطان) وە ئەم بەرگرییەش لە ڕوانگەی

بەداخەوە کەم کەم لەناو خەڵکا وەکو بـاقی تاوانـەکانی تـر پـەرەی سەندو، پیاوو ژن و عالم و عەوامی گرتەوەو، ئیتر بێ دەنگـەی لـێ کراو، گـەلی ئێمـەش وەکـو بـاقی گـەلان کەوتـە ئـەو داوە پیسـەو، بێجگە لە تاق تاقێ زانا نـەبێت کـە خـوا پاداشـتیان بداتـەوە هـەر باسیان نەکردووە.

# جگه ره‌کێش ئه‌بێ خۆی له کۆمه‌ڵ دوور خاته‌وه‌!!

کاکی موسڵمان! کاتێ که ئه‌و هه‌موو زیانانه‌ت سه‌باره‌ت به جگه‌ره کێشان زانی‌و هه‌ر به‌رده‌وام بویت له سه‌ری‌و نه‌ئایین و نه‌ویژدان و نه‌ژیری کاری تێ نه‌کردیت، ئینجا پێویسته وه‌ک ئه‌رکێکی ئایینی‌و کۆمه‌ڵایه‌تی‌و ته‌ندروستی ئه‌م چه‌ند شته‌ت له‌گه‌ڵدا ئه‌نجام بدرێت:

یه‌که‌م: جگه‌ره‌کێش ئه‌بێ له تێکه‌ڵاوبوونی خه‌ڵک به‌رگری کرێت له‌به‌ر ئه‌م هۆیانه:

أ- له‌به‌ر سه‌لامه‌تی‌و پاراستنی خه‌ڵک له نه‌خۆشی چونکه جگه‌ره‌کێش وه‌ک له پێشه‌وه باسمان کرد هه‌ڵگری میکرۆبی چه‌ندین نه‌خۆشی واگیره که یه‌کێکیان سیله‌، بڵاوکه‌ره‌وه‌ی چه‌ندین ده‌ردی بێ ده‌رمانی تره به‌هۆی دووکه‌ڵی جگه‌ره‌که‌یه‌وه، وه‌ک نه‌خۆشی شێرپه‌نجه (سرطان) وه ئه‌م به‌رگرییه‌ش له ڕوانگه‌ی

ئیسلامەوە شتێکی ڕەواو پێویستە. پێغەمبەری مەزن ﷺ ئەفەرموێت: (اذا وقع بأرضٍ فلا تدخلوها واذا أنتم فيها فلا تخرجوا منها)[8].

واتە: نەخۆشی واگیر هەر کات لە ولاتێکا ڕووی داو لەوێ بوون لێی دەرمەچن و، ئەگەر لەوێ نەبوون نەچنە ئەو ولاتەوەو، هەروەها ئەفەرموێت (زیان نی یە نە بۆ خۆت و نە بۆ خەڵک).

وە زانایان ئەڵێن: (فەرزی کیفایەیە بەرگری لە زیانی خەڵک).
وە دیسان ئەڵێن: (زیان ئەبێ لابرێت) وە دەیان بەڵگەی تر کە هەر یەکێکیان بەسە بۆ ڕەوا بوونی بەرگری کردنی جگەرەکێشان لە تێکەڵاوبوونی خەڵک، وە ئەم جۆرە بەرگریەش ئەمڕۆ لە یاسای هەموو دەوڵەتاندا هەیەو پێی ئەڵێن: بەرگری تەندروستی (الحجر الصحي)

ب- جگەرەکێش بەرگری تێکەڵاوبوونی خەڵکی لێ ئەکرێت لەبەر بۆنی دەمی، وە ئەم جۆرە بەرگریەیش دیسان شتێکی ڕەواو پێویستە لە ئیسلامدا، چونکە بۆنی دەمی ناخۆشەو ئازاردەری

---

[8] ئەم حەدیسە پیرۆزە بەم شێوەیە (اذا سمعتم الطاعون بأرض فلا تدخلوها واذا وقع بأرض وأنتم فيها فلا تخرجوا منها) متفق عليه به شێوەی تریش ڕیوایەت کراوە.

خەڵکی نزیکیەتی. پێغەمبەری مەزنﷺ ئەفەرموێت (هەر کەسێک لەو درەختە بۆندارانەی وەک سیرو پیاز بخوات لەو کاتەدا نزیکمان نەکەوێت) ئایا بۆنی پیاز ناخۆشە یان بۆنی جگەرە؟؟.

ج- دیسان بەرگری ناو خەڵکی لێ ئەکرێت تا خەڵکیش دووچاری ئەو ڕەوشتە پیسە نەکات. ئاشکرایە کە جگەرکێشان ڕەوشتێکی هاتووی پیسەو، بەرگریش لە شتی پیس پێویستە پێغەمبەری مەزنﷺ لەم بارەوە ئەفەرموێت (من سنّ سنةً سيئة كان عليه وزرها ووزر من عمل بها) واتە هەر کەسێک ڕەوشتێکی ناپەسەند داهێنێت، تاوانی ئەو ڕەوشتەی لەسەرە، هەروەها تاوانی ئەو کەسانەیشی لەسەرە کە پەیڕەوی لێوە ئەکەن، وە ئەم جۆرە بەرگرییەیش پێویستەو بەر یاسای (فرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە) ئەکەوێت و، دەیان بەڵگەی تریش لەم بارەوە هەیە، لەمە زیاتر لێرەدا ناگونجێ.

دووهەم: جگەرەکێش بەرگری نوێژی جەماعەتی لێ ئەکرێت چونکە ئەو بۆنەی دەمی ئەبێتە هۆی ئازار دانی نوێژکەران و، لەم بارەیشەوە پێغەمبەری دڵسۆزو خواناسﷺ ئەفەرموێت: (من أكل من هذه الشجرة فلا يقربنا ولا يصلّين معنا) واتە هەر کەسێک

ئیسلامەوە شتێکی ڕەواو پێویستە. پێغەمبەری مەزن ﷺ ئەفەرموێت: (اذا وقع بأرضٍ فلا تدخلوها واذا أنتم فيها فلا تخرجوا منها)[٨].

واتە: نەخۆشی واگیر هەر کات لە ولاتێکا ڕووی داو لەوێ بوون لێی دەرمەچن و، ئەگەر لەوێ نەبوون نەچنە ئەو ولاتەوەو، هەروەها ئەفەرموێت (زیان نی یە نە بۆ خۆت و نە بۆ خەڵک).

وە زانایان ئەڵێن: (فەرزی کیفایەیە بەرگری لە زیانی خەڵک).
وە دیسان ئەڵێن: (زیان ئەبێ لابرێت) وە دەیان بەڵگەی تر کە هەر یەکێکیان بەسە بۆ ڕەوا بوونی بەرگری کردنی جگەرەکێشان لە تێکەڵاوبوونی خەڵک، وە ئەم جۆرە بەرگری یەش ئەمڕۆ لە یاسای هەموو دەوڵەتاندا هەیەو پێی ئەڵێن: بەرگری تەندروستی (الحجر الصحي)

ب- جگەرەکێش بەرگری تێکەڵاوبوونی خەڵکی لێ ئەکرێت لەبەر بۆنی دەمی، وە ئەم جۆرە بەرگری یەیش دیسان شتێکی ڕەواو پێویستە لە ئیسلامدا، چونکە بۆنی دەمی ناخۆشەو ئازاردەری

---

[٨] ئەم حەدیسە پیرۆزە بەم شێوەیە (اذا سمعتم الطاعون بأرض فلا تدخلوها واذا وقع بأرض وأنتم فيها فلا تخرجوا منها) متفق عليه به شێوەی تریش ڕیوایەت کراوە.

خەڵکی نزیکیەتی. پێغەمبەری مەزنﷺ ئەفەرموێت (هەر کەسێک لەو درەختە بۆندارانەی وەک سیرو پیاز بخوات لەو کاتەدا نزیکمان نەکەوێت) ئایا بۆنی پیاز ناخۆشە یان بۆنی جگەرە؟؟.

ج- دیسان بەرگری ناو خەڵکی لێ ئەکرێت تا خەڵکیش دووچاری ئەو ڕەوشتە پیسە نەکات. ئاشکرایە کە جگەرکێشان ڕەوشتێکی هاتووی پیسەو، بەرگریش لە شتی پیس پێویستە پێغەمبەری مەزنﷺ لەم بارەوە ئەفەرموێت (من سنّ سنةً سيئة كان عليه وزرها ووزر من عمل بها) واتە هەر کەسێک ڕەوشتێکی ناپەسەند داهێنێت، تاوانی ئەو ڕەوشتەی لەسەرە، هەروەها تاوانی ئەو کەسانەیشی لەسەرە کە پەیڕەوی لێوە ئەکەن، وە ئەم جۆرە بەرگرییەیش پێویستەو بەر یاسای (فرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە) ئەکەوێت و، دەیان بەڵگەی تریش لەم بارەوە هەیە، لەمە زیاتر لێرەدا ناگونجێ.

دووهەم: جگەرەکێش بەرگری نوێژی جەماعەتی لێ ئەکرێت چونکە ئەو بۆنەی دەمی ئەبێتە هۆی ئازار دانی نوێژکەران و، لەم بارەیشەوە پێغەمبەری دڵسۆزو خواناسﷺ ئەفەرموێت: (من أكل من هذه الشجرة فلا يقربنا ولا يصلّين معنا) واتە هەر کەسێک

لەو درەختە -بۆندارانە- بخوات با نزیکمان نەکەوێتەوەو نوێژمان لەگەڵ نەکات!!

سێهەم: جگەرەکێش ئەبێ بەرگری هاتووچۆی ناو مزگەوتی لێ بکرێت، چونکە هیچ مزگەوتێک نی یە کە فریشتەی تیا نەبێت وە فریشتەکانیش هەر وەکو بنیام، تورەو بێزارن لە بۆنی ناخۆش و، ئەم جۆرە بەرگری یەیش دیسان شتێکی پەسەندە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکدا ئەفەرموێت: (من أكل البصل والثوم والكرّاث فلا يقربنّ مسجدنا فانّ الملائكة تتأذى مما يتأذى به بنو آدم) واتە هەر کەسێک پیازو سیرو کوڕاس[٩] (کەڕادە)ی خواردبێت و بۆنی دەمی مابێت، نزیکی مزگەوتەکانمان نەکەوێتەوە، چونکە بەڕاستی فریشتەکان ئازاریان پێ ئەگات بەو شتانەی کە بنیام ئازاری پێ ئەگات. بێ گومانە کە هەموو مرۆڤێکی دوور لە جگەرە بە بۆنی دەم و هەناسەی جگەرەکێش ئازاری، پێ ئەگات و ناڕەحەت ئەبێت،

---

[٩] کُرّاث، گیایە لە گیا بۆن ناخۆشەکان و خواردنی ئەبێتە هۆی میز زۆر کردن، بە ورد بوونەوە لەو فەرموودانە کە لەم بارەوە هاتووە بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە هەموو شتێکی بۆن ناخۆش قەدەغەیە بۆ مزگەوت.

ده به گوێرەی ئەو فەرموودە بەنرخەی پێغەمبەرﷺ فریشتەکانیش نارەحەت ئەبن لــە بــۆن و هەناســەی دەمــی جگــەرەکێش. کــەوابوو جگەرەکێش نابێ بچێتە مزگەوتەوە. جا برای خوێنەر! جوان ســەرنج لەم باسە بدەو، تەماشای هەندێ لە بەناو موسڵمان بکەو بزانــە کــە چەند بێ شەرمە سەبارەت بە خواو بە ئایینــە بەنرخەکــەی ئیســلام. لەباتی ئەوەی کە توخنیی نەکەون یان ئەگەر شەیتان و نەفس هەڵی دێران ئیتر خۆیان بە شایســتەی جومعــەو جەماعــەت نــەزانن و بــە پەلە لەو شتە پیسە بگەڕێنەوەو تەوبــە بکــەن و خۆیــان لــەو بــۆن و بەرامەو ژەنگە پاک کەنەوەو، ئینجا بــەرەو جومعــەو جەماعــەت و مزگەوت هەنگاو هەڵگرن، کەچی بە ڕیز لەناو ئازێتیدا لە زۆربــەی شوێنەکانی وڵاتەکــەماندا لــە مزگــەوتا دائەنیشــن و تەپڵــەک ڕیــز ئەکەن و لە جگەرەکێشاندا کێ بەرکێ ئەکەن و، مزگــەوت وای لــێ دێ وەکو قۆتانی ئاگر دراو!!

داخی گرانتر ئەوەیە کــە لای ژووری ئــەو کــۆڕو کۆمەڵانــە پیــاو مــاقوڵان یــان زانایــانی ئــایینی پــڕی ئەکەنــەوە!! پێشــینە وتویانــە "ئەگەر گۆشت بگەنێت خوێی تێ ئەکرێت، ئەی ئەگەر خوێ گــەنی، چی لێ بکەین؟"﴿انّ في ذلك لذكرى لمن كــان لــه قلــب أو القــى

لەو درەختە -بۆندارانە- بخوات با نزیکمان نەکەوێتەوەو نوێژمان لەگەڵ نەکات!!

سێهەم: جگەرەکێش ئەبێ بەرگری هاتووچۆی ناو مزگەوتی لێ بکرێت، چونکە هیچ مزگەوتێک نییە کە فریشتەی تیا نەبێت وە فریشتەکانیش هەر وەکو بنیام، تورەو بێزارن لە بۆنی ناخۆش و، ئەم جۆرە بەرگرییەیش دیسان شتێکی پەسەندە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکدا ئەفەرموێت: (من أكل البصل والثوم والكرّاث فلا يقربنّ مسجدنا فانّ الملائكة تتأذى مما يتأذى به بنو آدم) واتە هەر کەسێک پیازو سیرو کوڕاس[٩] (کەڕادە)ی خواردبێت و بۆنی دەمی مابێت، نزیکی مزگەوتەکانمان نەکەوێتەوە، چونکە بەڕاستی فریشتەکان ئازاریان پێ ئەگات بەو شتانەی کە بنیام ئازاری پێ ئەگات. بێ گومانە کە هەموو مرۆڤێکی دوور لە جگەرە بە بۆنی دەم و هەناسەی جگەرەکێش ئازاری پێ ئەگات و ناڕەحەت ئەبێت،

---

[٩] کُرّاث، گیایە لە گیا بۆن ناخۆشەکان و خواردنی ئەبێتە هۆی میز زۆر کردن، بە ورد بوونەوە لەو فەرموودانە کە لەم بارەوە هاتووە بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە هەموو شتێکی بۆن ناخۆش قەدەغەیە بۆ مزگەوت.

ده به گوێرەی ئەو فەرموودە بەنرخەی پێغەمبەرﷺ فریشتەکانیش ناڕەحەت ئەبن لــە بـۆن و هەناســەی دەمــی جگـەرەکێش. کـەوابوو جگەرەکێش نابێ بچێتە مزگەوتەوە. جا برای خوێنەر! جوان سـەرنج لەم باسە بدەو، تەماشای هەندێ لە بەناو موسڵمان بکەو بزانـە کـە چەند بێ شەرمە سەبارەت بە خواو بە ئایینــە بەنرخەکـەی ئیسـلام. لەباتی ئەوەی کە توخنیی نەکەون یان ئەگەر شەیتان و نەفس هەڵی دێران ئیتر خۆیان بە شایســتەی جومعـەو جەماعـەت نـەزانن و بـە پەلە لەو شتە پیسە بگەڕێنەوەو تەوبــە بکـەن و خۆیـان لـەو بـۆن و بەرامەو ژەنگە پاک کەنەوەو، ئینجا بـەرەو جومعـەو جەماعـەت و مزگەوت هەنگاو هەڵگرن، کەچی بە ڕیز لەناو ئازێتیدا لە زۆربـەی شوێنەکانی وڵاتەکـەماندا لـە مزگـەوتا دائەنیشـن و تەپڵـەک ڕیـز ئەکەن و لە جگەرەکێشاندا کێ بەرکێ ئەکەن و، مزگـەوت وای لـێ دێ وەکو قۆتانی ئاگر دراو!!

داخی گرانتر ئەوەیە کـە لای ژووری ئـەو کـۆڕو کۆمەڵانـە پیـاو مـاقوڵان یـان زانایـانی ئـایینی پـڕی ئەکەنـەوە!! پێشـینە وتویانــە «ئەگەر گۆشت بگەنێت خوێی تێ ئەکرێت، ئەی ئەگەر خوێ گـەنی، چی لێ بکەین؟»﴿إنّ في ذلك لذكرى لمن كـان لـه قلـب أو ألقـى

السمع وهو شهيد﴾.

بەڵێ ئەم جگەرە دانانەی مزگەوت لە ئازێتیدا وە یان لە هەندێ ماڵدا بۆ ئەوەیە بە قسەی خۆیان تا ئابڕویان نەچێت!! بەڵێ بۆ ئەوەی کە ئابڕویان نەچێت خۆیان بێ ئابڕوی لای خواو پێغەمبەرو فریشتەکان و خواناسان و هەموو عاقڵان ئەکەن؟؟!! هەی دۆشاو بەسەرتان لە جێگای بێ ئاودا. ئایا ڕێز لێ گرتنی خواو پێغەمبەرو پیاو چاکان و ژیران گرنگ و چاک و ڕەوایە، یان ڕێزی بێ شەرم و نەزان و هەوەس پەرستان؟؟!!

کاکی خۆ بە موسڵمان زان! کەمێ شەرم لە خوا بکە، ئەگەر یاسا بەرزو بەنرخەکەی ئیسلام فرمانڕەوات بێت نایەڵێت قەت توخنی مزگەوت بکەویت مادام جگەرەکێش بیت، چونکە تۆ لە هەموو میکرۆبێک پڕ مەترسی تری، ئازاردەری فریشتەو هەموو مرۆڤیت!! هیوادارم براو خوشکە موسڵمانەکانم لە یاسا پاک و خاوێنەکەی ئیسلام لانەدەن و هەوەس پەرستیو خۆبەزل زانین نەبێتە هۆی شەرمەندەییو سەرشۆڕی دنیاو قیامەتیان.

چوارەم: جگەرەکێش ئەبێ لە پارە خەرج کردن بەرگری بکرێت، چونکە ماڵ زایەکەرەو هەڵە خەرج وە ئەم بەرگری کردنەش

فرمانێکی ڕەواو پێویستە لە ئاییندا. خوای خاوەن هـێزو بەخشـندە ئەفەرموێت: ﴿ولا تؤتوا السـفهاء أموالكـم التي جعل ا لله لكـم قياماً وارزقوهـم فيهـا واكسـوهم وقولـوا لهـم قـولاً معروفاً﴾(النساء:٥) واتـە: نـەیدەن بـە دەسـت نـەفام و هەڵـە خەرجەکانەوە ئەو ماڵەی کە خوا ئێوەی کردووە بـە سەپەرشتیو، بژێوییان لەو ماڵە پێ بدەن و لیباسیان بۆ بکەن و قسـەی جوانیـان لەگەڵ بکەن. واتە ئامۆژگارییان بکەن بـا واز لـەو هەڵـە خەرجیـە بێنن. کـاکی موسـڵمان! ئەگـەر کەسـێک ڕۆژی نیـو دینـاری خـۆی بسوتێنێت یان فڕەی بدات چی پێ ئەڵێیت؟؟ ئایا ئەو کەسە بە ژیـر ئەزانیت؟ دەی باوەڕ بکە ئیشی ئەو نیو دینـار سـوتێنەرو فـڕەدەرە کـەم زیـان تـرو ژیرانـەترە، لـەوەی ڕوبعێـک بـە جگـەرە بـدات و بیکێشێت!!

کاکی موسڵمان! نیو دنیـا زایەکـەر مـادام درێـژە بـەو ئیشـەی بدات لە یاسای ئیسلامدا بەرگری ڕووی تـێ ئـەکات و مـاوەی پـێ نـادرێت بـەو شـێوە ئـەو پـارە زایـە بکـات ئەمـەش لـە پـەڕاوە فیقهیـەکاندا بەناوی (الحجر على السفه) هاتووەو، هەندێ لە زانا پایە بـەرزەکان بەلایانـەوە تەمـەن مـەرج نیـیـە، واتـە لەهـەر

السمع وهو شهيد﴾.

بەڵێ ئەم جگەرە دانانەی مزگەوت لە ئازێتیدا وە یان لە هەندێ ماڵدا بۆ ئەوەیە بە قسەی خۆیان تا ئابڕویان نەچێت!! بەڵێ بۆ ئەوەی کە ئابڕویان نەچێت خۆیان بێ ئابڕوی لای خواو پێغەمبەرو فریشتەکان و خواناسان و هەموو عاقلان ئەکەن؟؟!! هەی دۆشاو بەسەرتان لە جێگای بێ ئاودا. ئایا ڕێز لێ گرتنی خواو پێغەمبەرو پیاو چاکان و ژیران گرنگ و چاک و ڕەوایە، یان ڕێزی بێ شەرم و نەزان و هەوەس پەرستان؟؟!!

کاکی خۆ بە موسڵمان زان! کەمێ شەرم لە خوا بکە، ئەگەر یاسا بەرزو بەنرخەکەی ئیسلام فرمانڕەوات بێت نایەڵێت قەت توخنی مزگەوت بکەویت مادام جگەرەکێش بیت، چونکە تۆ لە هەموو میکرۆبێکی پڕ مەترسی تری، ئازاردەری فریشتەو هەموو مرۆڤیت!! هیوادارم براو خوشکە موسڵمانەکانم لە یاسا پاک و خاوێنەکەی ئیسلام لانەدەن و هەوەس پەرستیو خۆبەزل زانین نەبێتە هۆی شەرمەندەییو سەرشۆڕی دنیاو قیامەتیان.

چوارەم: جگەرەکێش ئەبێ لە پارە خەرج کردن بەرگری بکرێت، چونکە ماڵ زایەکەرەو هەڵە خەرج وە ئەم بەرگری کردنەش

فرمانێکی ڕەواو پێویستە لە ئاییندا. خوای خاوەن هـێزو بەخشـندە ئەفەرموێت: ﴿ولا تؤتوا السـفهاء أموالكـم الـتي جعـل الله لكـم قيامــاً وارزقوهــم فيهــا واكســوهم وقولــوا لهــم قــولاً معروفاً﴾(النسـاء:٥) واتـە: نـەیدەن بــە دەسـت نـەفام و هەڵـە خەرجەکانەوە ئەو ماڵەی کە خوا ئێوەی کردووە بـە سەپەرشـتیو، بژێوییان لەو ماڵە پێ بدەن و لیباسیان بۆ بکەن و قسـەی جوانیـان لەگەڵ بکەن. واتە ئامۆژگارییان بکەن بـا واز لـەو هەڵـە خەرجیـیە بێنن. کـاکی موسـڵمان! ئەگـەر کەسـێک ڕۆژی نیـو دینـاری خۆی بسوتێنێت یان فڕەی بدات چی پێ ئەڵێیت؟؟ ئایا ئەو کەسە بە ژیـر ئەزانیت؟ دەی باوەڕ بکە ئیشی ئەو نیو دینــار سـوتێنەرو فـڕەدەرە کـەم زیـان تـرو ژیرانـەترە، لـەوەی ڕوبعێـک بـە جگــەرە بـدات و بیکێشێت!!

کاکی موسـڵمان! ئیو دنیــا زایەکـەر مــادام درێــژە بــەو ئیشــەی بدات لە یاسای ئیسلامدا بەرگری ڕووی تــێ ئـەکات و مــاوەی پــێ نـادرێت بـەو شـێوە ئـەو پـارە زایـە بکــات ئەمــەش لــە پــەڕاوە فیقهیـیەکاندا بەناوی (الحجر علی السفه) هاتووەو، هەندێ لە زانا پایـە بـەرزەکان بەلایانـەوە ئەمــەن مــەرج نیـیـە، واتــە لەهــەر

تەمەنێکدا بێت هەر بەرگری ئەکرێت. دەی خۆ کاکی جگەرکێش لەو هەڵە خەرج ترو ماڵ زایەکەرترە، ئیتر چۆن لە خەرجکردن بەرگری ناکرێت؟! کابرای نیو دینار تەنیا زیانی نیو دینارەکەی داوە، بەڵام کاکی جگەرەکێش ڕوبعە دینارەکەی زایە کردووە هیچ، بای چەند ڕوبعیش زیانی بە لەش و تەندروستی خۆیو کۆمەڵ داوەو، بای چەند ڕوبعیش زیانی بە ئاوو هاواو، زیانی ئاییندەی بەیتولماڵ داوە بەهۆی ئەو نەخۆشیانەوە کە جگەرەکەی ئەم ئەبن بەهۆی. جا نیو دیناردز لە کوێو جگەرەکێش لە کوێ؟؟!!

پێنجەم: جگەرەکێش ئەبێ تەمێ بکرێت (التعذیر) بە فرمانی ئایین، مارگر ئەبێ تەمێ بکرێت بە مەرجێک کە زیانی مارگرتن لە سەدا سی ٣٠٪ تا لە سەدا پەنجایە ٥٠٪ بۆ کابرای مارگرە، چونکە زۆربەی مارەکان یان گەزندە نین وەیا ژەهریان نییە، بەڵام جگەرە زیانی لە سەدا سەد (١٠٠) هەیە بۆ جگەرەکێش و، زیانی لە سەدا سیشی ٣٠٪ هەیە بۆ خەڵکی دەوروبەری بە تایبەت بۆ منداڵ بە قسەی پزیشکەکان، دەی ئیتر چۆن جگەرەکێش لەم یاسایە دەرئەکرێت؟؟!!

خوێنەری بەڕێز! بەم شێوەیە بۆمان دەرکەوت کە جگەرەکێش

ئەبێ چوار دیوارێکی بێ کون و کەلەبەری بۆ دروست بکرێت چوار دەوری بە تەلی دڕکداری بەرگرییە تەندروستیو ئابوریو کۆمەلایەتیو بەرگرییە ڕەوشتیەکان و مرۆڤ دۆستەکان بتەنرێت تا نە بەکەس بگات و نەکەس پێی بگات بەلکو بەم شێوە یان دەردی بێ دەرمانی دەرمانکەین وە یان لە دەردی بێ دەرمانی دەرمانکات. جا ئەگەر وازی هێناو هاتەوە سەر خۆی ئینجا ئەزانێت ئێمە چەند دلسۆزین بۆیو ئەزانێت کە قازانجی قازانجمانەو زیانی زیانمانە ئێستایش هەر واین بۆی، بۆیە وا تورەین لێی، بەلام دەسەلات چییە، بە ئەخۆشی زەوق تاڵ ئاوی شیرین بدە ئەلێ تالە!!

# جگەرەکێشان تاوانێکی گەورەیە

کاکی موسڵمان! بە ورد بوونەوە لەو زیانانەی جگەرەو قەدەغە کردنی زیان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە وا بزانم بەسە بۆ ئەوەی کە بزانیت جگەرە تاوانە، دەی ئەوەش بزانە هەر تاوانێکیش کە زۆر بچوکیش بێت ئەگەر چەندبار کرایەوە بەبێ ئەوەی پەشیمان بوونەوە کەوتبێتە بەینیانەوە لە یاسای ئیسلامدا ئەو تاوانە با بچوکیش بێت بە تاوانی گەورە حیساب ئەکرێت.

دەی ئەگەر جگەرەکێشان بە تاوانێکی بچوکیش لە قەڵەم بدرێت چونکە بە زۆری دووپات ئەبێتەوە تاوانێکی گەورە (كبيرة)یە. کەوابوو پێویستە موسڵمانان توخنی نەکەون و تەوبە لە ڕابوردووی ئەو ئیشە پیس و تاوانە بکەن، ئەگینا شایستەی تۆڵەی سەختی پەروەردگارن.

# جگەرەکێشان هەموو کەس تاوانبار ئەکات

جگەرەکێشـان بێجگـە لـەو هـەموو زیانانـەی کـە لـە پێشـەوە باسمان کرد زیـانی تـری گـەورەی هەیـە کـە هـەموو موسـڵمانێک ئەگرێتەوە.

هیچ موسڵمانێک نی‌یە کـە بـەهۆی جگـەرە کێشـانەوە ڕۆژانـە دەیان تاوانی تووش نەبێت، ئەگەر چـی جگەرەکێشـیش نـەبێت، وە ئەگەر جگەرە کێشیش بێت ئەمەیشی بەسەرا زیاد نەبێت!!! چونکە جگەرە کێشان، تاوانـەو، بـەرگریش لـە تـاوان پێویسـتی سەرشـانی هەموو موسـڵمانانە با خۆیشی ئەو تاوانـە بکـات؟!! جـا دووپـات و دەپات و سەدپات بوونەوەی جگەرە لـە هـەموو جێگایـەک و لـەناو خـەڵکدا بووەتـە هـۆی مـاندوو بوونـی پیـاو چاکـان و خواناسـە چاکەکانیش و بە دەگمەن نەبێت باسی ناکەن. ئاشکرایە بۆ دەنگـی موسڵمانان لەو هەموو تاوانانە تاوانێکی زۆر گەورەیەو ئەبێتە هۆی ڕق و قینی خوای خاوەن دەسەڵات، دوور نی‌یە وەکو زانایـانی بـەنی

ئیسرائیلی بەر نەفرینی خوا کەوْن، چونکە ئەو زانایانە کاتێ ماندوو بوون لە فرمان بە چاکە کردن و بەرگری لە خراپە، تێکەڵاو بە خەڵکە تاوانکارەکان بوون و باسیان نەئەکردن، خوای گەورە نەفرینی لێ کردن و ئەم باسەیشی لە قورئانەکەی ئێمەدا تۆمار کردووەوە ئەفەرموێت ﴿لعن الذين كفروا من بني اسرائيل على لسان داود وعيسى ابن مريم ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون. كانوا لا يتناهون عن منكرٍ فعلوه لبئس ما كانوا يفعلون﴾(المائدة: ٧٩-٧٨).

واتە: نەفرین کراوە لەوانەی کە بێ باوەڕ بوون لەناو بەنی ئیسرائیلیاندا لەسەر زمانی داوودو عیسای کوڕی مەریەم (درودی خوا لە هەردوویان بێت) ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە سەرپێچیان کردو، لە سنوری یاسا دەرچوون. وە بەهۆی ئەوەوە کە بەرگری یەکتریان نەئەکرد لەو خراپانەی کە ئەیان کرد بەڕاستی ڕەفتارێکی پیسیان ئەنجام ئەدا.

بەڕاستی ئێمەیش ئەگەر چاک تەماشای خۆمان و دەورو بەر بکەین تێ ئەگەین کە بە موو لەو وەزعەی ئەوان لامان نەداوە چ تاوانێک ناکرێت؟؟ کێمان لە فرماندان بە چاکەو بەرگری کردن لە

خراپەدا سارد نین؟؟!! بارمان زۆر سووک نەبوو کاکی جگەرەکێش خۆی کرد بەسەر بار، تاوان کەم نەبوو خوشکی سەر رووت قۆڵ رووت خۆی خستە بازاڕ!! جا لەگەڵ ئەم هەموو ستەمکاریو تاوان و بێ خواییەدا هێشتا گەلێ لەخۆ بەدڵسۆز زانانی ئیسلام چوار مەشقیان داوە وەکو ئەوەی کە مێشێک میوانیان نەبێت؟! هەرکەس بە بیرو هەرکەس بە ڕایەک خۆی سەرگەرم کردووەو ئیسلام لە لایەک!!

خوێنەری بەڕێز جگەرەکێشان تاوانەو بەرگری لە تاوان پێویستەو بێ دەنگی سەبارەت بە تاوان ئەویش هەر تاوانە. کەوابوو جگەرە هەموو کون قوژبنێکی ژیانی لێ تاڵ کردووین و هیچ ڕۆشناییەکی بۆ ژیان نەهێلاوەتەوە، دەی ئایا پێویست نیە تا توخمی نەبڕیوین قۆڵی مەردانەی لێ هەڵکەین و توخمی لەسەر زەویدا ببڕین؟؟.

# جگەرە زیانی هەیە بۆ هەر پێنج بنەڕەتەکان

جگەرەکێشان زیانی گیانیو ماڵیو ئایین و ژیریو وەچەی (النسل) هەیە. جگەرەکێشان دیسان زیانی تەندروستیو لەشی هەیەو، ئەمانە هەموویان لە باسەکانی پێشوودا بە درێژی باسمان کردوون، پێویستە ئەوەش بزانین کە تەواوی ئایین و رێبازە خواییەکان و تەواوی هەوڵ و کۆششی پیاوچاکان لەم سەر زەوییەدا تەنیا وە تەنیا بۆ پاراستن و رەنگین کردن و رێک و پێک کردنی ئەو پێنج شتەی سەرەوەن، واتە: ئایین، گیان، ژیری، وەچە (النسل)و ماڵ. هەر شتێک زیان بە یەکێکیان بگەیەنێت مادام سوودی بوو گەورەتریان نەبێت حەرامە. ئاشکرایە جگەرە کەم و زۆر زیانی بۆ هەر پێنجیان هەیە کەوابوو ئیتر چۆن جگەرە حەرام نییە؟؟!!!

لێرەدا لەوانەیە هەندێک بڵێن چۆن جگەرە حەرام ئەکەیت، خۆ نەئایەت و نەحەدیسی لەسەر نییە؟؟ ئەڵێین: جگەرە حەرامە هەم

بە ئایەت هەم بە حەدیس هەم بە قیاس هەم بە ئیستیسحاب.

یەکێک لەو ئایەتانە کە جگەرە بە حەرام دائەنێت ئەم ئایەتەیە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وكلوا مما رزقكم الله حلالاً طيباً واتقوا الله الذي أنتم به مؤمنون﴾(المائدة:٨٨).

واتە: بخۆن لەوانەی کە ئێمە پێمان داوون و حەڵاڵن و پاکن و، بترسن لەو خوایەی کە ئێوە باوەڕتان پێی هەیە. لەم ئایەتەدا بێجگە لە حەڵاڵییەت پاکێتیشی فەرمووە، بۆ نمونە ئەگەر کەوچکێک هەنگوین یەک قەترە میزی تێ کەوت با هەنگوینەکە خۆی حەڵاڵە بەڵام چونکە پیس بۆوە حەرامە خواردنی. دەی خۆ جگەرە بێجگە لەوەی کە بەڵگە لەسەر حەڵاڵییەتی نیە ئاشکرایە شتێکی پیسە ئیتر چۆن حەرام نییە؟!

وە یەکێک لەو حەدیسانە کە بەڵگەیە لەسەر حەرامیەتی جگەرە ئەم حەدیسەیە کە ئەفەرموێت: (ان الله ينهاكم عن قيل وقال وكثرة السؤال وإضاعة المال) واتە: بەڕاستی خوا ئێوەی مەنع کردووە لە بێژراوو وتیو زۆر پرسیار کردن و زایەکردنی ماڵ. دەی ئایا جگەرە زایەکەری ماڵ نییە لە ڕێگایەکی بێ سوودەوە؟؟

وە یەکێک لەو قیاسانەی کە جگەرەی پێ حەرام ئەبێ قومارە، کە

سوودی هەیە بەڵام تاوانەکەی لە سوودەکەی زیاترە، دەی جگەرە ئەگەر سوودێکی تیا هەبێت لە کڕین و فرۆشتنەکەیدا دەیان تاوانی لە توتن شکاندنی بەشەوی و تێکەڵاوی کوڕو کچ و شریت لێدانیو جگەرەکێشانی تێدا هەیە، کەوابوو هەر بەو پێیە (قیاس)ە جگەرەو توتن حەرامن.

وە ئەمما هاوڕێیەتی (الاستصحاب) واتە: درێژە دان بە بوونی ئەوەی کە بووەو لابردنی ئەوەی کە نەبووە کە یەکێکە لە بەڵگە ئوسولیەکان حەرامیەتی جگەرەمان پیشان ئەدات، چونکە بە گوێرەی ئەم یاسایە هەر شتێک لەم زەوییەدا هەیە لە نان و ئاوەوە بگرە تا حەیوان و باڵندەو گژو گیا کە سوودیان هەبێت حەڵاڵە مادام بەڵگە لەسەر حەرامیەتی نەبێت، وە هەر شتێک لەوانە کە زیانی هەبێت حەرامە مادام بەڵگە لەسەر حەڵاڵیەتی نەبێت، دەی جگەرە سەرەڕای ئەوەش کە هیچ بەڵگەیەک لەسەر حەڵاڵ بوونی نییە زیانیشی ئاشکرایە هەروەها کاتێ کە توتن هاتە وڵاتی ئیسلامیەوە لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا و لە میسرا توتن نێژرا، بۆ یەکەم جار هەواڵی گەیشتە خەلیفەو خەلیفە فرمانی دا کە ئەو توتنە هەڵ گەڕایەوە دیارە، چونکە زانایان لەو سەردەمەدا

که شتێکی کەمیان لە زیانی ئەو توتنە ئەزانی بە حەرامیانی زانیو خەلیفە لەسەر بڕیاری ئەوان ئەو فرمانەی داوە. بەلای منەوە زانایانی ئەو سەردەمە لە ئێمە بە تەقواتر بوون و زیاتریش گوێیان بە ئایین داوە، پێویستە ئێمەیش پەیڕەوی لەو خاوەن باوەڕانەوە بکەین، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿فبهداهم اقتده﴾ واتە: چونکە ئەوان هیدایەت دراون تۆیش پەیڕەویان لێوە بکە. وە ئەفەرموێت: ﴿...ويتبع غير سبيل المؤمنين نولّه ما تولّى ونصله جهنم وسائت مصيراً﴾(النساء:١١٥).

واتە: ..وە ئەوانەی کە پەیڕەوی لە غەیری ڕێگای خاوەن باوەڕانەوە ئەکەن ئێمە ڕەشۆی خۆی ئەدەین بەدەست خۆیەوەو لەناو ئاگری جەهەننەمدا ئەیبرژێنین. وە پیسترین عاقیبەتە جەهەننەم.

کەوابوو پەیڕەوی کردنی زانا خواناسەکان لەسەر ئێمە لە هەموو بوارێکدا بە گوێرەی توانا پێویستەوە یەکێک لەو ئیشە گرنگانەی ئەوان دۆزینەوەی حوکم بوو بۆ ئەو شتانەی کە لە سەردەمی ئەواندا پەیدا بووەو هیچ ئایەت و حەدیسی ڕاستەوخۆی لەسەر نەبووە. جا ئێمەیش کە لەم سەردەمەدا ئەژین و زیانی جۆراو جۆری ئەم دووکەڵە پیسەمان بۆ دەرکەوتووە بە پەیڕەوی لەو زانا

خواناسانەوەو ئەنجامدانی ئەرکی سەرشمانمان (کە فرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپەیە) پێویستە ئەم تاوانە هەڵ سەنگێنین و بڕیاری لەسەر بدەین تا تاوانی ئەو تاوانە لەسەر شانمان لابەین.

زۆر جار لە زۆر کەسەوە ئەبیسم کە هەندێکیان خۆیان بە دلسۆزی ئایین ئەزانن ئەڵێن: تاوان زۆرەو جگەرە چییە باسی بکەین؟! براکانم منیش لەم قسەدا لە گەڵتانم کە تاوان زۆرە، بەڵام زۆربەی ئەو تاوانانەی کە ئەمڕۆ ئەکرێن و ئێمەیان خستوەتە ناو زەلکاوی بەد بەختیو ڕۆژ ڕەشیەوە، سەدان و هەزاران جار باسکراون و هی وایشیان هەیە کە دەیان پەڕاوی لەبارەوە نوسراوە، تەنانەت لە خەڵکی سادەیش بپرسیت ئەزانیو ئەڵێ گوناهو تاوانە، خۆ ئێمە ناڵێین ئەو تاوانانە بکرێن! -پەنا بەخوا لە قسەی وا- ئەوەندەی هەیە ڕووت و قوتی ئافرەت و جگەرەکێشان و بێ مویالاتیو کەمتەر خەمی موسڵمانان سەبارەت بە ئایین سێ گوناهی ئەم سەردەمەی ئێمەن کە گوناهی سێهەمیان دایکی هەموویانەو پێویستە خەبەرمان بێتەوەو هەوڵی بۆ بدەین. جا ئەگەر خوا لێم وەرگرێت وا خەریکی ئەم ئیشە گرنگەم و هەموو براو خوشکێکیشی بۆ هەڵ ئەنێم وە لەسەر تاوانی یەکەمیش دە

ساڵ لەمەو بەر کورتە باسێکم بەناو حیجابەوە نووسیوە، وا لەبارەی تاوانی دووهەمیشەوە بۆ ئەوەی سووکە ئەرکێکی سەرشانی خۆمم سەبارەت بە ئایین و گەلە هاوزبانەکەم و لەسەر داخوازی براو خوشکانی موسڵمانم بڕیاری نووسینی ئەم چەند لاپەڕەیەم داو هیوادارام کادیرە دڵسۆزەکانی ئیسلام لەگەڵ باسکردنی تاوانەکانی ئەم سەردەمەدا ئەم سێ تاوانانەشیان لەبیر نەچێت. جگەرە تاوانێکەو گەلێ خەڵکی دووچاری دەیان نەخۆشی کردووەو، سامانێکی زۆری موسڵمانان بەناڕەوا لەبەین ئەبات، ئەمە لە لایەکێ و، لە لایەکی ترەوە هەندێکێ هەن کە تەماع چاوی بەستوون لەو هەموو زیان و بەڵگانەو هێشتا ئەڵێن: واین لە گومانی حەرامیی و حەلاڵیدا بۆیە تەرکی ناکەین!! (ومن اتقی الشبهات فقد استبرء لدینه) واتە: هەر کەسێکێ دوور کەوێتەوە لە گومان بەڕاستی ئایینی خۆی پاراستوە. دیسان ئەوەش بزانن جگەرە لەگەڵ ئەو هەموو تاوانانەدا بەڵگەیەکی زۆر گەورەیە سەبارەت بەبێ ڕەحمیو بێ سۆزی جگەرەکێش دەربارەی هاوسەرو منالی خۆی، چونکە هەموو ڕۆژێکێ چەندین دینار لە دەمیان ئەگرێتەوەو بە کەللەبایی خۆی بە جگەرە لەبەینی ئەبات. هی وا هەیە کە قەرزی

بۆ ئـەكات و ژن و منـاڵی برسـییانە!! (من لا یرحَم لا یُرحـم).
کەسێ ڕەحم نەکات ڕەحمی پێ ناکرێت.

خوێنەری بەڕێز باوڕت ببێ کە من بەش بەحاڵی خۆم بـە پـەڕاو نووسین ڕازی نیم ئەگەر ناچار نەبم، چونکە قسەو پەڕاو زۆر زۆرن و پەکمان لە بەریان نەکەوتووە بەداخەوە کردەوە نی‌یە دەبا بەس بێـت (قیـل وقـال) بـا هـەندێک خۆمـان مەشـغوڵ بکـەین بـۆ گۆڕینـی بارودۆخمـان چونکـە ﴿ان الله لا یغـیر مـا بقـوم حتـى یغـیروا مـا بانفسهم﴾(الرعد:١١).

ئێمە لەم باسەدا بێجگـە لـەو مەبەسـتانەی کـە باسمـان کـردن مـەبەستێکی -وەکو لە پێشەوە هێمایەکمان بـۆ کـرد- گرنگترمـان هەیە ئەویش ئەوەیە کە ڕەفتاری هەندێک لە موسڵمانان وا پیشـان ئەدات سەبارەت بە جگـەرە، کـە ئـەگونجێت هـەندێ شـت هـەبن، ئیسلام چارەسەری و ڕێگای دروست یان نادروسـتیان نـەزانێت؟!! وە ئەتوانم بڵێم: ئەوە گرنگترین هاندەرم بوو بۆ وەڵام دانەوەی ئەو براو خوشکە موسڵمانانەم. وە وایش ئەزانم ئەگـەر ئینسـاف هـەبێت تـا ئێرە ئەوەندە ڕوون کرایەوە کە ئیسلام بۆ هەموو شتێک یاسـایەکی هەیەو شتێک نی‌یە بێ وەڵام بمێنێتەوە.

بەڵێ ئاینی پیرۆزی ئیسلام پێنج پارچە ئاسنی پێداوین و لەسەر هەر پارچەیەکیان یەکێک لەم شتانە نوسراوە: واجب، حەرام، سوننەت، مەکروە، موباح. وە ڕەوانەکەری ئایین خۆی دروستکەری جیهانە بەو هەموو شتانەی کە لەناویەتی و، هەموو شتەکانی وا دروست کردووە بە یەکێک لەو پێنج پارچانە هاوتایە، جا هەر شتێک لەم جیهانەدا ڕوو بدات ئەو پارچە ئاسنە دیاری کراوانە نەهێنین و بەترازووی ژێری زانا خواناسەکاندا هەڵی نەسەنگێنین لەگەڵ کامیاندا هاتەوە لەسەر بڕیاری ئیسلام ئەوەی لەسەر ئەنووسین، وە وەکو وترایش ئەم جیهانە بە هەموو شتێکیەوە بە شێوەیەکی ڕێک و پێک و ئەندازەگیرییەکی تەواو دروست کراوە ﴿کلّ شيء عنده بمقدار﴾ وە دروستکراوی ڕەوانە کەری یاساکەیە.

هەندێ ئەڵێن (فەرموودەی: رحمة لکم فلا نسيان)ە بەسە کە ئێمە ئیتر قسەی لەسەر نەکەین! یەکەم: ئەم فەرموودەیە بۆ ئەوە بوو کە لەکاتی وەحیا پرسیار نەکەن ئەوەک ئەو شتە لەسەریان واجب کرێت، وە لە پاشا نەتوانن ئەنجامی بدەن، چونکە واجب بوون لەسەر داخوازی خۆت سەخت ترە.

دووەم: ئەگەر بە قیاس هیچ شتێک بەڕەوا یان ناڕەوادا نەنراوە

ئەوە ئەو قسە ڕێی تێ ئەچێت، وە ئەوەش بزانە کە ئەم فەرموودەیە لەگەڵ حەرامیەتی جگەرەدا هیچ دژایەتیەک ناکات، چونکە خوای گەورە لەو حەدیسەدا فەرموویەتی: حەرام و حەڵاڵمان بۆ ڕۆشن کردونەتەوە، ئەوەی کە باسمان نەکردووە، لە بیرمان نەچووە، بەڵکو سۆزێکە بەرانبەر ئێوە ئەنجام دراوە، جا ئەگەر چاو لەو هەموو ئایەت و فەرموودانە بقونجێنین حەرامیەتی جگەرە بە قیاس ڕوونە، دەی ئایا قیاس هەم وەرگیراو لە فەرموودەی خوای گەورە نییە؟ ئاشکرایە کە وەڵامت بەڵێیە. دەی ئێمەیش ئەڵێین بە قیاس واتە: بە گوێرەی فرمانی خوا جگەرەکێشان قەدەغەو حەرامە نەک بە ئارەزۆکاری. وا لە خوارەوە چەند بەڵگە بە گوێرەی هەڵسەنگاندن (قیاس) لەسەر حەرامیەتی جگەرەتان بۆ باس ئەکەین بەو هیوایەوە کە ئەم باسە دوا باسی سابت بوونی حەرامیەتی ئەو دووکەڵە پیسە بێت ئەمەش ئەو بەڵگانەن:

یەکەم: خوای گەورە عارەق و قومارى مەنع کردووەو ئەفەرموێت: ﴿یسألونك عن الخمر والمیسر قل فیهما اثم کبیر ومنافع للناس وإثمهما أکبر من نفعهما﴾(البقرة:٢١٩).

واتە: ئەی موحەممەدﷺ سەبارەت بە عارەق و قومار

پرسیارت لێ ئەکەن بڵێ: لە هەردووکیاندا تاوانی -زیانی- گەورە هەیەو چەندین سوودیش بۆ خەڵک، وە تاوانەکانیان -زیانەکانیان- گەورەترە لە سوودەکانیان. جا ئەگەر ئەڵێین عارەق مرۆڤ سەرخۆش ئەکات بۆیە قەدەغەیە خۆ قومار کەس سەر خۆش ناکات و، لایەنێکی کە کابرای قومار بەرەوەیەوە سوودێکی گەورەی بەماوەیەکی زۆر کەم دەست ئەکەوێت، بەڵام لەبەر زیانی گەورەتر کە یەکێکیان بێ ئاگا بوونە لە یادی خواو کەمتەر خەمیە لە نوێژ قومار حەرام کراوە، جا ئەگەر قومار چەند سوودی هەیە خۆ جگەرە کێشان هیچ سوودێکی تیا نییە، دەی بەم هەڵ سەنگاندنە وا دەر ئەکەوێت کە جگەر کێشان لە قومار کردن خراپترە!! کەوابوو ئەگەر نەڵێین لە قومار حەرام ترە! وەکو قومار حەرامە. وەکو ئوف کردنی ئەولاد لە رووی باوک و دایکیانداو لێدانیان، قومار وەکو ئوف کردن وایەو جگەرەکێشان وەک لێدان ئەوەڵی هەردووکیان واتە: قومار کردن و ئۆف کردن حەرامە بە نەسسی قورئان، بۆ قومار ئەوە بوو کە زانیت و بۆ ئۆفیش خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ولا تقل لهما أف﴾ واتە: لە رووی باوک و دایکتا ئۆف مەکە. چونکە ئازاریان پێ ئەگات، دووهەمی هەردووکیان حەرامە واتە:

جگەرەکێشان و لێدانی باوک و دایک بە قیاس بە شێوەیەکی زیاتر، چونکە زیانی ئەو دووانە زیاترە تا زیانی قومارو نۆف.

دووهەم: خۆکوشتن حەرامە چونکە خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ولا تقتلوا أنفسكم﴾ واتە: خۆتان نەکوژن. جگەرەکێشان هۆیەکی زۆر گەورەیە بۆ لەبەین بردن و کوشتنی مرۆڤ. ئاشکرایە هەر شتێکیش کە مرۆڤ بەرەو مەرگ ببات حەرامە مەگەر بۆ پارێزگاری نایین وەکو حەرامیەتی ژار خواردن. دەی بەم هەڵسەنگاندنەیش (القياس) دووبارە حەرامیەتی جگەرەمان بۆ دەر ئەکەوێت.

سێهەم: زیادەڕەوی حەرامەو خوا ئەفەرموێت: ﴿ولا تسرفوا انه لا يحب المسرفين﴾ واتە: زیادە ڕەوی مەکەن بەڕاستی خوا زیادەڕەوی کەرانی خۆش ناوێت. وەختێک جگەرە هەڵ ئەسەنگێنین ئەبینین کە کەم شتێک هەیە وەکو جگەرە زیادەڕەوی تیا بکرێت، کەوا بوو جگەرەکێشان حەرامە.

چوارەم: ماڵ بە فیڕۆدان حەرامە چونکە خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ولا تبذر تبذيراً﴾ جگەرەکێشان ماڵ بە فیڕۆدەرە کەوابوو جگەرەش حەرامە. وە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەری

مەزنداﷺ هاتووە کە خوا سێ شتی ئێمەی پێ ناخۆشە یەکێکیان ماڵ زایە کردنە (اضاعة المال).

پێنجەم: شورشە خواردن حەرامە چونکە زیانی هەیە بۆ لەش وە زیانی جگەرە زیاترە کەوا بوو جگەرە حەرامترە.

شەشەم: مار گرتن خەتەری گیانی تێدایە بۆیە مارگرتن حەرامە خۆ لە جگەرەشدا خەتەری گیانی بە ئیسباتی‌یە. کەوا بوو جگەرەکێشان حەرامە.

حەوتەم: زیان لە ئیسلامدا قەدەغەیە چونکە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێت: (لا ضرر ولا ضرار) واتە: زیان نی‌یە.

خۆ جگەرە زیان هێنەرە. کەوا بوو جگەرە حەرامە. بەڕاستی ئەم شەش خاڵەی دوایی نەک هەر بە قیاس بەڵکو بە خودی نەسسەکان حەرامە. ورد بەرەوە.

هەشتەم: حەرام خواردن بۆمان پێویستە خۆ جگەرە دژی مانە (الحیاة) ئیتر چۆن ناڕەوا نی‌یە؟؟!!.

نوهەم: خۆڵ خواردن حەرامە، چونکە زیانی تەندروستی هەیە، ئاشکرایە زیانی جگەرە بۆ لەش و تەندروستی زیاترە، دەی چۆن حەرامتر نی‌یە؟؟!!

دەهەم: خوێنی (جاري) حەیوانی حەلاڵ حەرامە بە نەسسی قورئان، چونکە زیانی هەیە بۆ تەندروستی. خۆ زیانی جگەرە لە خوێن زیاتر نەبێت کەمتر نییە جا بەو پێیەش (القیاس) جگەرە حەرامە.

کاکی موسڵمان، ئەگەر کەسێک خۆی گێل نەکات و هەواو هەوەس پەرستی پاڵی پێوە نەنێت کە خۆی بخاتە ژێر دەستی شەیتانەوە ئەم باسە کورتە بەسە بۆ تێگەیشتن لە جگەرەو زیانیو حەرامیەتی، بەڵام ئەوەش بزانە کە ئیسلام نایەت هەموو هۆی تاوان کۆکاتەوەو لەبەردەم خەڵکا دایبنێت و لە پاشا بەو خەڵکە بڵێت وریا بن نزیکی تاوان نەبنەوە. بۆ نموونە: ئیسلام رێگا نادات کە ئافرەت و پیاوی نامەحرەم تێکەڵاو ببن وە ماوە نادات بە ئافرەت کە سەرو سینەو قۆڵی ڕووت کات و ئەوان بۆ هەر جێگایەک و لەگەڵ هەر کەسێکدا کە ئەیەوێت مادام مەحرەمی خۆی نەبێت بچێت بۆ گەڕان و لە حەوزە گشتییەکاندا بە تێکەڵاوی لەگەڵ پیاواندا مەلەوانی بکات و ئەوان بە جوتە لە گۆشەی دانیشگاکاندا لێی پاڵ داتەوەو ئینجا پێی بڵێت: نابێ زینا بکەیت!!! چونکە بەڕاستی ئەم شێوە بەرگرییە لەگەڵ ئەوەشدا کە

سەخت و دژوارە زۆر گەوجانەیشە. وە ئەم جۆرە کردارو هەڵوێستانە لـە فەرهـەنگی پـاک و خـاوێنی ئیسـلامدا نـەبوون و نـابن وە ئـەم بەرگرییە بێ ڕەحمانە لە گیانە پڕ سۆزەکەی، ئیسلامەوە دوورە وە ئەگەر خاوەن بـاوەڕێک ئـاوا بۆچوونێکـی هـەبێت بـە تونـد هـێرش ئەکاتە سەری و ئەفەرموێت ﴿أفتؤمنون ببعض الكتاب وتكفرون ببعض ؟!﴾ واتە: ئایا باوەڕتان هەیە بە هەندێک لـەو کیتابـەو بـێ باوەڕن بە هەندێکی؟!

خوێنـەری بـەڕێز، نێوانـی ئیسـلام و ئـەو جـۆرە بۆچـوون و هەڵوێستانە وەک ئاسمان و زەوی وایە، ئایینی پیرۆزی ئیسـلام بـۆ ڕیشەی تاوان ئەگەڕێت وە لە ڕیشەدا وشکی ئەکات. دیـارە ڕیشـەی تاوان وەکـو ڕیشـەی دارو درەختـەو دۆزینـەوەی زەحمـەت و ئیشـی ئەوێ. منداڵێک وەختێ چـاوی بـەدار توێـەک ئەکـەوێت وا ئـەزانێت ئەگەر لق و پۆپەکەی ببڕێت وشـک ئـەبێت چونکـە بـێ ئاگایـە لـە ڕیشەکەی، جا بۆچوونی ئەم یاسا دەستکردانەی ئەمڕۆ لە ڕاستیدا بە چەندین پلە لە بۆچوونی ئەو منداڵە نزم ترە!!

بەڵێ ئیسلام بۆ بنەبڕ کردنی ئـەو تاوانـە گەورەیـە -زینـا- لـە ڕیشـەوە دەسـت پـێ ئـەکات پیشـەکیی ئـەڵێ ئـافرەت و پیـاو بـا

خوشک و برایش بن، تەمەنیان گەیشتە دە ساڵ نابێ بە یەکەوە بخەون و، بالغ بوون ئەبێ بێ هاوسەر نەبن، وە ئەگەر توانای مارەیی نەبوو پێویستە ڕۆژوو بگرێت تا هێزی ئارەزۆ نزم بێتەوە. وە هەردووکیان ڕاستەوخۆ بە لێپرسراوو ئەزانێت سەبارەت بە خۆپاراستن لە بێگانەو پێویستە تەنانەت چاوەکانیان سەبارەت بە نامەحرەم دوور گرن و، زۆر داکۆکی ئەکاتە سەر ئەم ئیشانەو بە ڕیشەی تاوانی ئەزانێت و، سزای سەختیی داناوە بۆ ئەوانەی کە بە پێچەوانەی ئەو خاڵانەوە ڕەفتار بکەن. ئاوا ئەم ڕیشەیە وشک ئەکات و خۆ بە پەل و پۆ برینەوە زۆر خەریک ناکات. دیارە ئەگەر ئەم ڕیشە وشک کراو چاو ڕامی کابرا بۆ ئیتر شتەکانی تر وەکو شتێکی خەیاڵیان لێ دێت، بۆیە ئیسلام ئەوەندە داکۆکی ئەکاتە سەرو ئەفەرموێت: ﴿قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم...﴾ وە ئەفەرموێت ﴿وقل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن﴾ بەڕاستی ئەگەر ئافرەت و پیاو هەردوو ڕیشەی تاوانیان ناسیو خۆیان لەو ڕیشانە دوور خستەوە ئیتر چۆن دووچاری ئەو تاوانە گەورەیە ئەبن؟! بەڕاستی لەناو گەلێکدا کە ئاوا پەروەردە بکرێت ئەئافرەتی وەکو بووکە شووشەی لێ دێت و هەردەم لە دوکانێکاو هەر سات بەدەست

یەکێکەوە بێت، وە نەپیاویش بەو کارە ناپەسەندانە چ بۆ خۆی و چ بۆ دایک و خوشک و خێزانی، ڕازی نەبێت.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام تاوا بەکۆ فەسادو خراپەو تاواندا نەچێت. بنیشەکی ڕیشەی ئەو تاوانە، ئەدۆزێتەوەو لە ڕیشەکەوە ئەو تاوانە وشک ئەکات، هەرگیز لە ناوەڕاستا خەریکی چارەسەرکردنی کێشەو کاروبار نابێت، پێویستە لە بچوکەوە ڕێگای تاوان بگیرێت نەگینا کەم کەم وەک نەخۆشی شێرپەنجە (السرطان) تەشەنە ئەکات و بەبێ لەناو بردنی تاوانبار چارەسەر ناکرێت -لێرەدا مەبەستمان بۆچوونە دادگەرانەکەی ئیسلام بۆ بن بڕ کردنی هەموو نەخۆشیەکان و نەهێشتنی تاوانە نەک بەستنەوەی فرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) بە کات و قۆناغی تایبەتیەوە-. براو خوشکە موسڵمانەکان جا هەر بەو شێوەی کە باسمان کرد ناگونجێ جگەرە کێشان قەدەغە بکرێت و بەشتێکی حەرام بزانرێت بەڵام ڕیشەکەی ئەدۆزرێتەوەو بن بڕ نەکرێت، ناگونجێ جگەرەکێشان حەرام بێت بەڵام دروست کردن و کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ بێت!! بەڵکو پێویستە ئەم تاوانە پیس و گیان سێنەرو ماڵ بەفیڕۆ دەرە لە ڕیشەوە کە توتن کردنە وشک

کرێت ئەگینا ماوەدان بە توتن کردن و، قەدەغە کردنی جگەرە هەروەکو رووت و قوتی ئافرەت و تێکەڵاوی و لە پاشا بەرگری کردنی فەسادە -زینا-؟! کەوابوو هەر چۆنێک تەماشای ئافرەت و پیاوی نامەحرەم بۆ یەک تاوانە بە نەسسی قورئان چونکە ڕیشەی فەسادە وە یەکەم هەنگاو بەرەو تاوانە، هەر بەو پێیەش (القیاس) توتن کردن و کڕین و فرۆشتنیشی حەرامە.

ئەگەر ئەڵێیت: توتن کردن سوودی ماڵی هەیە با لە دوایی‌دا زیانی هەبێت، ئێمەیش ئەڵێین: لابردنی زیان پێش هێنانی سوودە (دفع الضرر مقدم علی جلب المنفعة)[10].

ئەگەر ئەڵێیت: بە توتن ماڵێکی زۆر کۆ ئەبێتەوە بۆ توتن کاران. ئێمەش ئەڵێین: کۆ کردنەوەی سەروەت و سامان نەک پێویست نییە بەڵکو شتێکی ناپەسەندە لە یاسای ئیسلامدا و، خوای گەورە بۆ ئەوەی سامان لەلای هەندێک کۆ نەبێتەوەو هەندێک فەقیرو کەم دەست بمیننەوە هەر لەگەڵ ئاخر لەحزەی تەواو بوونی گیاندا ماڵەکەی دابەش ئەکات و دەست کەوتەکانی

---

[10] واتە: لابردنی زیان پێش خراوە لەسەر هێنانی سوود. ئەمە یەکێکە لە دەستوورو قاعیدە، ئوسولییەکان، بۆ دەرهێنان و زانینی حوکم لە قورئان و حەدیس دا.

جیهـاد بەسـەر خـەڵكێكی زۆردا دابـەش ئـەكات و ئەفـەرموێت ﴿لكيلا يكون دولةً بين الأغنياء منكم﴾(الحشر:٧).

واتە: تا ماڵ لە دەستی سەروەتمەنداندا كۆ نەبێتەوە.

پێویستی سەرشانی موسـڵمانان، دەرهێنـانی ماڵـە لـە ڕێگـای حەلاڵـەوە كـە بژێـوی خۆیو ئەوانـەی خـەرجی لەسـەریەتی دابـین بكات، نەك هەوڵی ناڕەواو كۆكردنەوەی سامان -بەڵام ئـەم قسـەی ئێمە لەگەڵ بوونی دەیـان ئایـەت و حـەدیس لـەم بـارەوە لـەلای دڵ نەخۆشانی بەناو موسڵمان لە تاڵی جگەرە تاڵ ترە چـار چییـە؟ بـە نەخۆش ئاوی شیرین بدە ئەڵێ: تاڵە!!.

كەوا بوو پێویستە لەسەر ئەوانەی كە خۆیان بە موسڵمان ئەزانن و، ئەترسـن لـە خـواو لـە ڕۆژی دوایـی هـەر چۆنێـك پـارەی سـوود (الربا)و شیربایی‌و، بەرتیل ناخۆن و بە شتانێكی پیـس و ناڕەوایـان ئەزانن هـەروا پـارەی جگـەرەو توتـن نـەخۆن و لـەو تاوانـەش دوور كەونەوە. ئاشكرایە ئەگەر پارەی توتن نەخوات، نایشـی كـات و بـۆ هەمیشە موسڵمانان و كۆمەڵە ڕەنگینەكەی قورئان لـەو دووكەڵـە پیسە ڕزگاریان ئەبێت ((هەر كەسێ كەسە ئەڵێ بەسە)).

# جگە رە دوژمنی شۆڕشگێرە

شۆڕشگێڕ، بەو مرۆڤە دڵسۆزو تێکۆشەرە ئەڵێن کە لە ڕێگای سەربەرزیو بەختەوەری گەلەکەیدا لە هەموو سوودێکی تایبەتی خۆی چاو پۆشی ئەکات و، بۆ خۆشبەختیو بەرژەوەندی خەڵک، خۆی ئەتاو دەیان و سەدان تەنگو چەڵەمە فڕە ئەدات.

شۆڕشگێڕ ئەو کۆڵنەدەرەیە کە هەزاران ڕێگای سەخت و پڕ مەترسی لە درێژایی تەمەنی ناو شۆڕشیا بەدوای دوژمنانیدا ئەبڕێت و، ساڵەها شەونخونی ئەکێشیو گیان لەسەر دەست لەگەڵ مەرگداو بۆ گەیشتن بە ئاوات شێرانە ئەجەنگێو، بە ژیانی ژیانی دوژمنانی تاڵ ئەکات و، بە بوونی خەو لە چاوی دوژمنانی بار ئەکات و، بە مەرگی سەرشۆڕی مەرگیی دوژمن مۆر ئەکات.

ئەم شۆڕشگێڕە، دڵسۆزو قارەمانە هەمیشە ئاگای لە خۆیەتی، خۆی لە پیلان و تەڵەکەی دوژمن ئەپارێزێت و، لانەی ئومێدو ئاواتەکانی دوژمن وێران ئەکات و چاوی لە هەموو کون و کەلەبەرێکە، نەوەک دوژمنی فێڵباز لەو ڕێبازەوە ڕێ بباتە سەری، هەر بۆیە پێویستە ئەو شۆڕشگێڕە عادەت و باوی خۆی بگۆڕێت و

هیچ شتێک نەکات بە عادەتی هەمیشەی -بێجگە لە یادی بەدیهێنەری- ئەوەک دوژمن بەو باوەی بزانێت و لەو ڕێگایەوە بیخاتە داوەوە- کورت کردنەوەی نوێژو، چۆنیەتی کردنی، لەکاتی جەنگدا ڕوونترین بەڵگەی ئەم قسەمانە- شۆڕشگێڕ بەر لە هەموو شتێک خواحافیزی لە دایک و باوکیو ژن و منالی نەکات و بەجێیان نەهێڵێت و، سەروەت و سامانی خۆی ئەگەر هەیبێت لە پێناو هێنانە دی مەبەستیان فیدای نەکات و، قەت بە تەمای کۆکردنەوەیشی نابێت. ئاشکرایە شۆڕشگێڕێکی وا هیچ شتێک نابێت بە عادەت بۆی بێجگە لە مەبەستە پیرۆزەکەی، وە لەبیر هیچ شتێکدا نابێت بێجگە لە ڕەزامەندی خواو ئاسوودەیی گەلەکەی.

ئەو شۆڕشگێڕە ئەبەزو کۆڵنەدەرە لە درێژایی تەمەنی شۆڕشەکەیدا نەک سەروەتمەند نەبووەو نابێت، بەڵکو زۆر جاریش ئەبێت کە بەبێ شێو بەدڵی پڕ لە سۆزی ڕێبازەکەیەوە سەر ئەنێتەوە، چونکە شۆڕشگێڕ کودەتاچی نییە کە لەناو نازو نیعمەتا پەروەردە بووبێت و، دووبارە بکەوێتە ناو دەریای سەروەتەوە، بەڵکو شۆڕشگێڕ مرۆڤێکی ستەم لێکراوو دەربەدەرە، بە ڕەش و

رووتی بەڵام بە باوەڕێکی زۆر بەهێز بە ڕێبازەکەی لە بەرانبەر دوژمنی خواو خەڵک دا قارەمانانە وەستاوە. وە ئەو شتە کەمەیش کە دەستی ئەکەوێت یان لە دەستی دوژمن دری ئەهێنێت یان خەیراتی خەیرۆمەندانە وە یان گۆشتی سەر تەڵەی ڕاوچیانە! - جاری وا هەیە ئەو قارەمانە لەتاو ئاگر خۆی ئەهاوێتە ناو دەریا!- بە هەر حاڵ ئەو جۆرە شۆرشگێرە تا سکێک تێر بێت دە سک برسی یەو، ئەگەر شتێکیشی بۆ بهێنێتەوە دەیان برای هاوسەنگەرو دەیەن هاوسەری برا شەهیدەکانی و سەدان منداڵیان بەکەم دەستی و نیازمەند ئەبینێت و پێویستە ئەو زیادەش بەوان بدات، چونکە ئەوان بێجگە لە سۆزو ڕەحمی خوا غەیری شۆڕش هیچ دەرێکی تر شک نابەن و بە تەمای شۆڕشەوە ئەژین، وە لەو شۆڕشگێرە دڵسۆزە وە دوورە کە ئەو شتە کەمە کە لەخۆی زیادە هەروا بە کەللەبایی بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی خەرجی کات چ جای خەرج کردن ئەو شتانەدا کە قەدەغەن. جوان تر بڵێین، لە فەرهەنگی شۆرشی ڕەواو ڕاستەقینەدا بەهیچ شێوەیەک عارەق و بیرەو قومارو جگەرە بەدی ناکرێت، چونکە ئەگەر موسڵمانیش نەبن ئەوانە شتانێکی زیادەن و زیان هێنەرو پێویستیان بە پارەی زیاد هەیە،

دەی شۆڕشگێڕ ئەو پارەیە لەکوێ دێنێت؟؟! وە ئەگەر ئەو شۆڕشگێڕێکی وا بێت کە باسمانکرد ئەو پارەیەی چۆن و کەی لێ زیاد ئەبێت؟؟! ئەوەی ڕاستی بێ بەرچاو کەوتنی ئەو شتە قەدەغانەی کە باسمانکردن لە هەر شۆڕشێکدا، ئەو شۆڕشەو لێپرسراوانی لە لایەن خەڵکی دڵسۆزو شۆڕش پەروەرەوە، ئەکەوێتە بەرپرسیارو، لە مێشکی ئەو خەڵکەدا دەیان پرسیار هاتووچۆ ئەکات، ئەو خەرجیەیە زیادانە بۆ؟! کامەیە سۆزو بەزەیی ئەو شۆڕشگێڕانە سەبارەت بە منداڵان و هاوسەرانی شەهیدەکانیان؟؟!! وەختێ بۆ هاوسەنگەرانی خۆیان وابن ئیتر بۆ خەڵک چۆن ئەبن؟؟ وە...؟؟ وە دەیان پرسیاری تر.

برای شۆڕشگێڕ! ئەو کەسەی کە سەروەت و سامانی شۆڕش بۆ سوودو بەرژەوەندی تایبەتی خۆی خەرج ئەکات بە تایبەت بۆ عادەت و باوی نارەوا نەک هەر شۆڕشگێڕ نیە بەڵکو زەرووەو خوێن مژی شۆڕشگێڕان. بەداخەوە شۆڕشەکانی ئەم سەردەمەمان لەم دیاردانەیان، زۆر تێدایە بەتایبەت جگەرەکێشان کە هەموو کون قوژبنێکی ئەم جیهانەی گرتووەتەوەو زاری هەموو کەسێکی تاڵ کردووەو دووکەڵە سیلاوییەکەی هەموو لایەکی گرتووەتەوە!!

موسڵمان و نا موسڵمان، دانیشتوو شۆڕشگێڕ. ئەگەر ناموسڵمان بڵێ: من گوێم لە چاک و خراپ و حەڵاڵ و حەرام نییە!! ئەی کاکی شۆڕشگێڕی موسڵمان تۆ بە چ بەڵگەیەک جگەرە ئەکێشی؟؟! ئەگەر کابرای دانیشتوو ئەڵێت: من عادەتم پێوە گرتووەو پێم تەرک ناکرێت!! هەر چەند قسەکەی ئەمیش زۆر بێ جێیە، بەڵام بهانەیەکی منداڵ خەڵەتێنی هەیە، ئەی کاکی شۆڕشگێڕ تۆ چ بیانویەکت هەیە؟؟! خۆ موسڵمان خۆی لە حەرام ئەپارێزێت و شۆڕشگێڕ باوو عادەت ناناسێت.

خوێنەری بەرێز، جگەرە کێشان بۆ شۆڕشگێڕ بێجگە لەو هەموو زیانانەی کە تا ئێستا باسمان کرد، دەیان زیانی دەستەو یەخەی تری هەیە بۆ شۆڕشگێڕ، کەوا لە خوارەوە هەندێکیان ئەخەینە ڕوو:

١- هەناسە تەنگیو کۆکین کە دوو شتی زۆر زیان هێنەرن بۆ، شۆڕشگێڕ بە تایبەت لە جێگای پڕ مەترسیو لە کاتی ماندوو بووندا کە شۆڕشێگێڕ هەمیشە ماندووەو بە زۆریش لە جێگای پڕ مەترسی دایە.

٢- کەم خۆریو زوو برسی بوون کە هەردوولا، هەر زیانە، بۆ لەش و بۆ ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی شۆڕشگێڕ، چونکە زۆر

جاری وا ئەبێت کە شەو و ڕۆژێک بەڵکو زیاتریش نان و ئاوی دەست ناکەوێت.

٣- جگەرەکێشان ئەبێتە هۆی دەرکەوتن و ئاشکرابوونی ڕێگاو جێگای شۆڕشگێڕ بە تایبەت لەشەودا. ئەمەش زیانێکی یەکجار زۆرە چونکە جاری وا ئەبێت ئەبێتە هۆی ئاشکرا بوونی بنکەیەک و لە دەست دانی چەند قارەمانێکی شۆڕشگێڕ، یان هەڵوەشینەوەی چالاکی‌یەکی سەربازی یان دەرباز بوون و، وەخۆ کەوتنی دوژمنان، کە ئەمانە هەموویان زیانن بۆ شۆڕش و شۆڕشگێڕ.

٤- بەر بوونەوەی ئاگر کە زیانی ئەمەش ئاشکرایە بە تایبەت لە لای شۆڕشگێڕ، چونکە درەختێکی بچوک بۆ ئەو کۆشکێک ئەژێت.

خوێنەری بەڕێز، لەگەڵ ئەو هەموو زیانانەدا زۆر دوور نی‌یە کە کابرای جگەرەکێش، لەبەر نەبوونی پارەو دەست نەکەوتنی جگەرە واز لە شۆڕشەکەی بێنێت و ڕەنجی چەند ساڵەی خۆی زایە بکات. وە یان بۆ بەدەست خستنی پارەی جگەرەکەی شان بداتە بەر هەندێ ئیشی سووک و لە پلەی شۆڕشگێڕی دابەزێنێت و دووچاری خیانەت و ناپاکی بکات.

خوێنەری بەڕێز! ئێستا ئیتر ڕەئیت چۆنە بەرانبەر بەو کەسانەی کە ئەو هەموو زیانانەی جگەرە بزانن و بڵێن: ناتوانین جگەرە تەرک کەین چونکە عادەتمان پێوە گرتووە؟؟

برای شۆڕشگێڕ، مەگەر تۆ ئەو عادەتەی خۆتت (جگەرەکێشان و شتی تری نارەوات) بەلاوە گرنگترو خۆشەویست ترە لە باوک و دایک و هاوسەرو منداڵەکانت؟!! ئەگەر وابێت دەی خاک بەسەر ئەو گەلەی کە چاوەڕوانی سۆزو بەزەیی تۆ بێت. ئەوەش بزانە کە جگەرە بە باوکردن لەهیچ عادەتێکی تر نەگرنگترە نەبەرێزتر، بەڵکو بە پێچەوانەوە عادەت و باوێکی زۆر نارەواو زۆر ناپەسەندەو دژی ئایین و گیان و ماڵ و ئەوەو ئازادیو تەندروستیەو، پێویستە قەت توخنی نەکەویت.

لە کۆتاییدا ئەڵێم:

١- ئەوەی لەم چەند لاپەڕەدا سەبارەت بە جگەرە نووسیومە دەرکی خۆمە لە قورئان و حەدیس و بڕیارو فتوای چەند زانایەکی پایە بەرزی ئیسلام و هیچ سەرچاوەیەکی تازەم لە دەستا نەبوو، جا تا ئەو جێگایەی کە لەگەڵ قورئان و حەدیسدا هاوتا بێتەوە فەزڵ و شانازی هی خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ وە ئەوەیشی کە هاوتا

نەیەتەوە هەڵەی منە لەگەڵ داوای چاوپۆشی. هیوادارم برایان و خوشکانی موسڵمان و هاوزبانم لە دوعای خێر بێ بەشم نەکەن.

٢- ئێمە تەنها ویستومانە ئەم دووکەڵە پیسە حوکمە شەرعی‌یەکەی بزانین نەکێ شتێکی تر، چاوەڕوانین کە برا پزیشکە هاوزبانەکانیشمان لەم بارەیەوە ئەرکی سەر شانی خۆیان ئەنجام بدەن، هیچ نەبێت نامیلکەیەکی چەند پەڕەیی سەبارەت بە زیانەکانی جسمیو ڕەوانی ئەو دووکەڵە پیسە بلاو کەنەوە، تا زیاتر براو خوشکە هاوزبان و موسڵمانەکانمان زیانی ئەم دووکەڵە پیسە بزانن، بەڵکو بەزوی ڕیشەی لەبن هەڵ کەنن، بەلام بە مەرجێک ئەوانیش لاسایی ئێمە نەکەنەوە!! واتە: هەر بڵێن و خۆیان ئەنجامی نەدەن. وتراوە: داری لار سێبەری ڕاست نابێتەوە.

ئیتر بەهیوای ژیانێکی پڕ لە دادو بێ دووکەڵ

والسلام على من اتبع الهدى

وصلى الله على قائدنا وحبيبنا ورسول رب العالمين محمد وعلى آله واصحابه اجمعين.

عبدالقادر تەوحیدی

١٣٦٧/١١/١٥ کۆچی هەتاوی

ژماره ناوەڕۆك لاپەڕە